


ژمارە

٢٠

( کانوونی دووەم ) ی ٢٠٠٧


# گۆڤاری کۆمپیوتەر


گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات


- گوتنەوەی وانە لەگەل بەرنامەیەکی بەسوود بۆ مامۆستایان و بیژەران

- درووست کردنی ( MENU ) و کۆپی کردنی ( DVD ) بە بەرنامەی نیرۆ

- چۆنیتی درووست کردنی سکرین سەیڤەر لە وێنەکانی خۆتان

- ڕیپۆرتاژێک دەربارەی ڕۆلی کۆمپیوتەر لە بواری ئەندازیاری



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە


هەولێر ـ ٢٠٠٧



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە
٢٠
کانوونی دووەمی ٢٠٠٧

**گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات**

**تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت**

**ناونیشان :**
هەرێمی کوردستان/ عێراق - هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەلا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا
نهۆمی دووەم شوێنی نووسینگەی گۆڤاری کۆمپیوتەر بۆ هەر پێشنیار و سەرنجێک
یان ناردنی بابەتێک .پەیوەندی بکەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە :
دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری - بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر - یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : **2527054** یان مۆبایلی سەرنووسەر **07504618045**

**یان پۆستي ئەلکترۆنی :**

**E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com**
**aras_co_center@yahoo.com**





**ئاگاداری :**
بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بڵاو کردنەوە لەگۆڤارەکەمان با بەتەواوی ئاماژە بکەن بەناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن وەهەروەها دەبێ رەچاوی رێسای نووسین بکەن لەگەڵ خالبەندی بۆ نووسینەکەیان بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە

# پێرســــــت





# ناوەڕۆکی سیدی ژمارە ٢٠

ئا : هێرش ئسماعیل

| بەشی دژە ڤایرۆس | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| Anti Vir Personal Edition Classic v7.0 | دژە ڤایرۆس |
| AVG Anti-Virus v7.1.375 | دژە ڤایرۆس |
| Bit defenderv9.09 | دژە ڤایرۆس |
| G Data Anti...worm 1.009.0149 | دژە ڤایرۆس |
| McAfee AVERT Stinger 2.6.0 | دژە ڤایرۆس |
| NOD32 Antivirus System v2.51.20 for Windows NT20002003XPx64 (FULL) | دژە ڤایرۆس |
| Norton Anti Virus 2006 | دژە ڤایرۆس |
| Win Anti Virus Pro 2006 2.0.205.5 | دژە ڤایرۆس |
| **بەشی ئەنتەرنێت** | **کاری بەرنامەکە** |
| Flash Player Pro v2.6 | بەرنامەیەکە تایبەتە بە خوێندنەوەی فایلی جۆری فلاش |
| Flash Sound Grabber v1.05 | بەرنامەیەکە تایبەتە بە دەرکردنی بەشی دەنگ لە فلاش |
| G Mail FS1.0.9 | بەرنامەی پۆستی ماڵپەری گۆگل |
| Google Earth | بەرنامەیەکە تایبەتە بە نیشاندانی هەموو شوێنێکی سەر زەمین لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە |
| Hide IP Platinum 2.6 | بەرنامەیەکە تایبەتە بە شاردنەوەی IP |
| Icq 5.0.4 | بەرنامەی گفت و گۆ چات کردن ICQ |
| Icq tools 2006 | شریتی ICQلەسەر نیشاندەری ئەنتەرنێت ئێکسپلۆرەر |
| MIRC 6.17 | بەرنامەی گفت و گۆ چات کردن MIRC |
| Save Flash 3.0.62 | بەرنامەیەکە تایبەتە بە پاراستنی فایلی فلاش لە ئەنتەرنێتەوە |
| Skype 2.0.0.97 for Windows | بەرنامەی گفت و گۆ چات کردن Skype |
| Where Is IP 2.20 Build 0629 | بەرنامەی ناسینەوەی کۆدی IP |
| Yahoo Password Recovery 1.0 | بەرنامەی گەڕاندنەوەی پاسۆردی یاهوو |
| Yahoo! Messenger 7.5.0.647 | بەرنامەی گفت و گۆ چات کردن Yahoo |
| **بەشی گرافیك و وێنە** | **کاری بەرنامەکە** |
| Adobe Acrobat Reader 7.0.7 Full | بەرنامەی تایبەت بە پەڕگەی ئەلکترۆنیەکان |
| Batch Image Resizer 2.65 | بەرنامەی کەم کردنەوەی قەبارەی وێنەکان بە کشێوەی کۆمەڵ |
| Business Card Designer Pro v3.0 | بەرنامەی درووست کردنی کارتی کەسی |
| Corel Photo Album Deluxe 6.0 | بەرنامەی درووست کردنی ئەلبوم |
| Photo Filter Studio 7.3.1 | ستۆدیویەکی تەواو لە فلتەرەکانی وێنە |
| Photo Watermark Professional 6.1.2.2 | بەرنامەیەکی تایبەتە بە دەست کاری وێنە |

| بەشی ڤیدیۆ و دیڤیدی | كاری بەرنامەكە |
|---|---|
| 1 DVD Ripper 2.2.0 | بەرنامەی گۆڕینی جۆرەكانی دیڤیدی |
| 1 Video Converter 4.1.5 | بەرنامەی گۆڕینی جۆری فۆرماتەكانی ڤیدیۆ |
| Allok AVI to DVD SVCD VCD Converter 1.6.4 | بەرنامەی گۆڕینی ئەو جۆرە فۆرماتانەی كە لە بەرنامەكەدا نووسراون |
| AVI Div X to DVD SVCD VCD Converter v1.42 | بەرنامەی گۆڕینی ئەو جۆرە فۆرماتانەی كە لە بەرنامەكەدا نووسراون دەرچووی پێشووتر |
| Cyber Link Power DVD Copy 1.0.0.701 | بەرنامەی پاوەر دیڤیدی بۆ نیشاندانی جۆرەكانی دیڤیدی |
| DVD Fab Platinum 2.9.7.2 | بەرنامەیەكی تایبەتە بە دیڤیدی |
| DVD Idle Pro 5.9.7.0 | بەرنامەیەكی تایبەتە بە درووست كردنی شێوەكانی دیڤیدی |
| DVD X Utilities 2.1 | بەرنامەیەكی تایبەتە بە بەكارهێنانی جۆرەكانی دیڤیدی |
| DVD-Cloner III 3.06 Build 889 | بەرنامەیەكی تایبەتە بە زۆربەی جۆرەكانی دیڤیدی |
| Golden Hawk CDRWIN 4.0C Unicode | بەرنامەیەكی تایبەتە بە كۆپی دیڤیدی و برینی بەشێك |
| Im TOO AVI MPEG Converter v2.1.59.0206B | بەرنامەیەكی تایبەتە بە گۆڕینی فۆرماتی جۆری Avi بۆ MPG |
| Inter video Win dvd Creator V2.5.b | بەرنامەیەكە تایبەتە بە درووست كردنی دیڤیدی |
| King dia DVD Ripper Professional 2.5.1 | بەرنامەی گۆڕینی فۆرماتی دیڤیدی |
| Photo To VCD SVCD DVD Converter v1.7 | بەرنامەی گۆڕینی وێنە بۆ شێوەی ڤیدیۆ |
| Super DVD Factory 5.7 | بەرنامەیەكە تایبەتە بە درووست كردنی دیڤیدی |
| Zealot All Video Splitter 2.5 | بەرنامەیەكی تایبەتە بە پارچە كردنی بەشی ڤیدیۆیی |
| Zealot RM to VCD SVCD DVD Converter v2.7 | بەرنامەی گۆڕینی جۆرەكانی ڤیدیۆ |
| **بەشی خاوێن كردنەوە** | **كاری بەرنامەكە** |
| Active Privacy Guardian Washer V1.25 | تایبەت بە خاوێن كردنەوەی كۆمپیوتەر لە پاشماوە زیادەكان |
| Error Doctor 2006 1.2 | بەرنامەی چارەسەری كێشەكانی كۆمپیوتەر |
| fast cleaner | بەرنامەیەكی خێرا بۆ خاوێن كردنەوە |
| Free RAM XP Pro 1.52 | بەرنامەی بەتاڵ كردنەوەی ڕامی كۆمپیوتەر |
| Fresh UI 7.55 | تایبەت بە خێرا كردنی سیستەم |
| History Cleaner 3.13 | تایبەت بە سڕینەوەی هیستۆری |
| Spam Washer 2.0.1000 | تایبەت بە خاوێن كردنەوەی كۆمپیوتەر لە فایلە زیادەكان |
| Super Cleaner 2.9 | بەرنامەیەكی خێرا بۆ خاوێن كردنەوەی كۆمپیوتەر |
| Surf Trail Washer 1.10 | بەرنامەیەكی خێرا بۆ خاوێن كردنەوە |
| Tracks Eraser Pro v5.61 | بەرنامەیەكی خێرا بۆ خاوێن كردنەوەی كۆمپیوتەر |
| **بەشی فەرهەنگ** | **كاری بەرنامەكە** |
| babylon 5.0.6(r13) | فەرهەنگی بابیلۆنی بەناوبانگ |
| English-Persian Dictionary | فەرهەنگی فارسی ئنگلیزی و بە پێچەوانەوە |
| Free Lang Dictionary | فەرهەنگی هەمە چەشن |
| Dictionary Istgah | بۆفەرهەنگی ستاج |
| Saeb Dictionary | فەرهەنگی سەیاب |

**تێبینی : لەگەڵ ٥٠٠٠ هەزار ئایكۆنەی جۆرا و جۆری هەموو بوارەكان كە بۆ زۆر كار بەكاردێت**

# چۆنێتی درووست كردنی Menu بۆ DVD لەگەڵ چۆنێتی كۆپی كردنی DVD بەبەرنامەی Nero

ئا: باوكی ئەلەند

وەك ئێمە دەزانین بەرنامەی نیرۆ بەرنامەیەكی زۆر بەهێزە كاری كۆپی كردن و خەزنكردنی تراكی دەنگە بۆناو كۆمپیوتەر بەلآم توانای كۆپیكردنی دیڤیدیشی هەیە بەشێوەیەكی سەركەوتوو هەروەها توانای دانانی لیستی سەرەتا واتا Menu ی هەیە بە جوانترین شێوە ئەم كارەش ئەمڕۆ زۆر گرنگە واتا ئەگەر هات ئێمە ئاهەنگێكی خێزانیمان هەبێت بمانەوێ بیكەین بە دیڤیدی ئەوا بەرنامەی نیرۆ بەجوانترین شێوە ئەم كارەمان بۆئەنجام دەدات و هەروەها لیستی مینیۆش بە جوانترین شێوە بۆمان دروست دەكات بەڕاستی من بە زۆربەرنامە كۆپیم كردوە بەلآم كاری هیچ بەرنامەیەكم وەك بەرنامەی نیرۆ پێ جوان نەبووە لەبەرئەوەی لەكاتی لێدانەوەی دیڤیدیەكە بەڤیدیۆ هیچ گرفتێك بەدی ناكرێ ئەمەش زۆر گرنگە بۆیە من دەتوانم بڵێم بەرنامەی نیرۆ باشترین بەرنامەیە بۆ كۆپیكردن ئنجا من ئێستا كاری كۆپیكردنی




دیڤیدی بە بەرنامەی نیرۆ هەروەها كاری دانانی لیستی مینیۆتان بۆ باس دەكەم بەلآم ووریابن بەووردی لەگەڵمابن بۆ ئەم كارە لە بەرئەوەی چەند هەنگاوێكی یەك بەدوای یەكە ئەگەر ئەم هەنگاوانە بەرێك و پێكی ئەنجام بدەن و هەروەها یەك بەدوای یەكدا پاش و پێشی نەخەن ئەوا دڵنیابن ئێوەش ئەم كارە زۆر بە ئاسانی ئەنجام دەدەن بەرنامەی نیرۆ دەرچووی ٦ و دەرچووی ٧ دەتوانن دیڤیدی پێ كۆپی بكەن ئێوەش دەتوانن لە نووسینگەكانی كۆمپیوتەر ئەم بەرنامەیە پەیدا بكەن یاخود لە سایتی www.nero.com ئێستا دێینە سەر باسكردنی چۆنیەتی كۆپیكردنی دیڤیدی بە بەرنامەی نیرۆ سەرەتا بەرنامەی نیرۆی دەرچووی ٧ دادەبەزێنین لەسەر ئامێری كۆمپیوتەرەكانمان من لە بەرئەوەی باس لەسەر دەرچووی ٧ دەكەم لە بەرئەوەی هەر ئەو دەرچووەم دابەزاندوە لە سەر كۆمپیوتەرەكەم پاشان دێین بەرنامەی نیرۆ دەكەینەوە لەسەرەوەی بەرنامەكە لەناوەڕاست بۆشاییەك هەیە كە CD/DVD لەناویدا نوسراوە بەماوس كلیكێكی لەسەر دەكەین لیستێكی لێدەبێتەوە كە DVD CD CD/DVD تێدا نووسراوە ئێمە دێین DVD هەڵدەبژێرین سەیری وێنە ١ بكە

پاشان لە لای چەپی بەرنامەکە لە لای سەرەوە شێوەی ئەستێرەیەك هەیە ماوس دێنینە سەر ئەو شێوەیە دەبینین سێ ئایكۆن پەیدا دەبێت ئێمە لێرەدا ئیشمان شێوەكەی ناوەڕاستە كە Make Your Own DVD-Video لە تەنیشت ئایكۆنەكە نوسراوە سەیری وێنە٢ بكە



یەك كلیكی لای چەپی لەسەر دەكەین دەبینین شێوەكەی دەگۆڕێت و شێوەی وەكوو ئەم لیستە دەبێتەوە كە لە وێنەی ژمارە٣ دا دیارە



پاشان لە سەرەوەی ئەم لیستە لە لای راست Add Video Files هەیە یەك كلیكی لە سەر دەكەین بۆ ئەوەی ئەو پارچە ڤیدیۆیەی هەڵمان گرتوە لەناو كۆمپیوتەر بێنینە ناوبەرنامەی نیرۆ وێنە٤



پاشان لیستێكی تر دەبێتەوە كە لیستی كردنەوەی هاردەكانە ئنجا پارچە ڤیدیۆكەی كە لە ناوهارد دامانناوە یەك كلیكی لەسەر دەكەین پاشان open لێدەدەین وێنە٥



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی Open ڤیدیۆکە دەچێتە ناو بەرنامەی نیرۆ و هێمایەك نیشان دەدات چاوەڕێ دەکەین تا ئەو هێمایە پردەبێتەوە وێنەی ٦



ئنجا کە بەشە ڤیدیۆکان دەچنە ناو بەرنامەکە لە ناو بۆشایی بەرنامەکە بەشە ڤیدیۆکان دەبینین و یەك بە دوای یەك هەر بەهەمان شێوە هەموو ڤیدیۆکانی ناو هاردەکە دەگوازینەوە بۆ ناو بەرنامەکە بڕوانە وێنەی ٧



پاشان NEXT لێ دەدەین ئنجا لیستێکی نوێ دێت کە لیستی درووستکردنی مینیۆیە لە لای چەپ لە سەرەوەی ئەم لیستە نوێیە My Disc نووسراوە هەروەها لە ژێرەوەی ئەوەش بۆشاییەکی بچوك هەیە کە هەمان نووسینیMy Disc تێدا دووبارە بۆتەوە دەتوانیت بۆ خۆت بە ویستی خۆت نوسینەکەی بگۆریت وێنەی٨




هەروەها لە لای راستی ئەم لیستە نوێیە لەسەرەوە لە بۆشاییەك Default نووسراوە بە گۆرینی ئەم ئەم Default ەش دەتوانی لیستی مینیۆی جۆرا و جۆر بە ویستی خۆت بێنیتە ناو بەرنامەکە وێنەی٩



هەروەها لە خوارەوەی ئەم لیستەش Edit Menu هەیە یەك کلیکی لە سەر بکە چەند شتێکی جۆراو جۆر دێت کە دەتوانیت بە جوانترین شێوە لیستی مینیۆ برازێنیتەوە وێنە١٠



پاشان دوو جار نێکست لێدەدەین ئنجا لیستێکی نوێ دێت کە لە خوارەوە لە لای راست Burn نوسراوە یەك کلیکی لەسەر دەکەین کرداری کۆپیکردن تەواو دەبێت وێنە١١



# به‌رنامه‌ی Adobe Premier

زنجیره(١٤)

ئا: فه‌یسه‌ل مه‌عروف

زیادكردنی ده‌قی نووسراو بۆسه‌ر دیمه‌نه‌كان (به‌شی دووه‌م)

به‌مه‌به‌ستی زیادكردنی جوله‌ی نوسین بۆئه‌وه‌ی له‌به‌شی ژێره‌وه‌ی شاشه به‌ده‌ركه‌وێت ئه‌م هه‌نگاوانه ده‌گرینه به‌ر

١ـ سه‌ره‌تا كێرسه‌ری ماوسه‌كه ده‌به‌ینه سه‌ره‌تای هێلی نووسین و بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ش دوگمه‌ی Home له كیبۆرد داده‌گرین ، پاشان چه‌ند جارێك دوگمه‌ی Ente داده‌گرین بۆئه‌وه‌ی چه‌ند هیلێك به به‌تالی بمێنێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و ده‌قه‌ی كه ده‌ینوسین له به‌شی ژێره‌وه‌ی په‌نجه‌ره‌ی Title ده‌ربكه‌وێت . (وێنه‌ی١).




٢. كرداری بینین ئه‌نجام ده‌ده‌ین به جولاندنی نیشانه‌ی بینین Rolling Title Slider . (وینه‌ی٢).



٣. ئێستا هه‌ڵده‌ستین به هه‌ڵبژاردنی ره‌نگی ده‌قه‌كه ، ده‌قه‌كه هه‌مووی یا به‌شێكی دیاری ده‌كه‌ین (به ئاره‌زووی خۆمان) چوار گۆشه‌ی ره‌نگه‌كان Object Color كلیك ده‌كه‌ین .(وێنه‌ی٣).







٤ـ ده‌توانین ره‌نگه‌كان كاڵ یا تۆخ بكه‌ین ،ئه‌مه‌ش به به‌رزكردنه‌وه و كه‌مكردنه‌وه‌ی به‌های Opacity به كلیك كردن له‌سه‌ر نیشانه بچوكه‌كه و پاشان هه‌ڵبژاردنی دوگمه‌ی Start Transparency و Transparency End له ناوه‌راست بۆهه‌ردووكیان یا هه‌ریه‌كه و به‌ته‌نیا (وێنه‌ی٤).




٥ـ ئیستا هه‌ڵده‌ستین به دروستكردنی سێبه‌ر بۆ ده‌قه‌كه‌مان ، له‌به‌شی Shadow Position كێرسه‌ری ماوسه‌كه ده‌جوڵێنین و تا شێوه‌كه‌ی وه‌ك شێوه‌ی ده‌ستی لێ دێت ئینجا ده‌یخه‌ینه سه‌ر شێوه‌ی پیتی Tنێو په‌نجه‌ره‌كه دایده‌گرین پله‌ی سێبه‌ره‌كه به‌ره‌و لای راستی خواره‌وه راده‌كێشین ، تێبینی ژمێره‌ری لادان بكه له‌سه‌رووی په‌نجه‌ره‌كه هه‌وڵده‌ده‌ین به‌های لادانه‌كه بره‌كه‌ی (٧X١٦)بێت . (وێنه‌ی٥).

٦. سه‌یر ده‌که‌ین که‌وا سێبه‌ری ده‌قه‌که ره‌شه له‌په‌نجه‌ره‌ی نمایش Title(وینه‌ی٦).




٧. ئێستا هه‌ڵده‌ستین به هه‌موارکردنی ره‌نگی سێبه‌ره‌که ، سه‌ره‌تا ره‌نگی سێبه‌ره‌كه Shadow Position هه‌ڵده‌بژێرین كه به‌و تیشكه‌ی له‌وێنه‌ی ٧دیاره ، پاشان نیشانه‌ی هه‌ردوو سێ گۆشه بچوكه‌كه كه له هه‌ردوولا هه‌ن به كار ده‌هێنین (وێنه‌ی٧–ژماره١) ، به‌هاى ره‌نگی ره‌ش زیاد ده‌كه‌ین تا ده‌گاته ١٠٠٪ (وێنه‌ی٧–ژماره٢)ئه‌م كرداره دووباره ده‌كه‌ینه‌وه بۆ ره‌نگه‌كه‌ی تری به‌رامبه‌ر .



٨. سێبەری دەقەکە پاش گۆڕینی ڕەنگەکەی بووە ڕەنگی ڕەشی تۆخ (وێنەی٨).




٩. پەنجەرەیTitleدادەخەین وەکاتێك بەرنامەی Adobe Premier داوامان لێ دەکات کەوا ئەمTitleە هەڵبگرین ، بەناوێك هەڵدەگرین و لە کتێبخانەی بابەتەکانی پرۆژەکەمان تاوەکو بەکاری بهێنین بۆ فایلەکانی تری پرۆژەی داهاتوومان (وینەی ٩).



# بەرنامەی
# DivX Converter

وەك هەمومان دەزانین دونیا بەردەوام لەپێشکەوتن دایە بەهەموو شێوەیەك بەردەوام شتی نویٚ دەردەچێت و هەروەها بەردەوامیش شتی تازە و سەرکەوتوو دەردەچێت وە بۆئەوەی ئێمەش دانەبڕێین لە هەموو ئەوشتە تازەو پێشکەوتوانە هەروەها بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاشنای هەمووشتە تازەکان ببین دەبێت هەولْدەین لێیان نزیك بینەوە و هەولْدەین خۆمان داهێنانەکان درووست بکەین خۆشەویستان وەك هەمومان دەزانین ئێستا نیزامی ڤیدیۆی دوا تەکنەلۆجیایە کە لەبەرٚ چاوانمان دیارن بەلاْم هەر لەئێستاوە شتی پێشکەوتوو بەدیار دەکەون وەك MP٤ کە سیستەمێکی زۆر پێشکەوتووە لە dvd واتا لەسەر یەك سی دی ڤیدیۆی بەنیزامی mp٤ زۆر شتی لەسەر جێدەبێتەوە و هەروەها روونیەکەشی زۆر باشترە لە ڤیدیۆی بەلاْم وەك گوتم دونیا بەردەوام لەپێشکەوتن دایە شتی نویٚ و پێشکەوتوش بەردەوام لەزیاد بوندایە بۆیە ئێمەش هەولْماندا شتێکی زۆر نویٚ و پێشکەوت و بخەمە بەرچاوان کە ئەویش سیستەمی DVX ە کە زۆر پێشکەوتووە لەم بوارەدا و تا ئێستاش وەکوو بەرنامەیەکی شاراوە بووە بۆیە ئێمە تیشکی دەخەینە سەر و باسی دەکەین ئامێری DVD جۆرێکی نوێی لێدەرچووە کە سیستەمی DVX دەخوێنێتەوە وە ئێستاش بەردەوام جۆری زۆریان لیٚ پەیدا بووە و ئەوەش موژدەیەکی گەورەیە لە بەرئەوەی سیستەمی DVX قەبارەیەکی زۆربچوکی هەیەو هەروەها وێنەکەشی یەکجار ڕوونە واتا لەسەر یەك سیدی ڤیدیۆی زۆر شتی DVX ی لەسەر جێگای دەبێتەوە هەر بۆیەش باسی DivX Converter دەکەین بەرنامەی DivX Converter بەرنامەیەکی زۆر بەهێزە و بەپێچەوانەی ئەوەش بەکارهێنانی شتێکی زۆرئاسانە ئەم بەرنامەیە لەتوانای داهەیە هەمووجۆرە ڤیدیۆێك بگۆرێت بۆ DivX بە قەبارەیەکی بچوك و بە وێنەیەکی یەکجار جوان بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیەش یەکجار ئاسانە سەرەتا پاش دابەزادنی بەرنامەکە دێین بەرنامەکە دەکەینەوە شێوەی بەرنامەکە زۆربچوکە هەروەها لەسەرەوەی بەرنامەکە لەناوەڕاست VIEW LIST نوسراوە وێنەی١

یەك کلیکی لای چەپی لە سەردەکەین لیستێك دەبێتەوە بڕوانە وێنەی ٢

لەم لیستەدا و لە بەشی خوارەوە Add نوسراوە واتا هێنان یەك كلیك لەسەر ئەو فەرمانە دەكەین دەبینین لیستی هاردەكان دەبێتەوە بڕوانە وێنەی ٣



ئنجا دوای دەركەوتنی بەشە هاردەكان ئەو ڤیدیۆیەی دەتەوێ بێتە ناوبەرنامەكە لە ڕێگای open ەوە دەیهێنیتە ناو بەرنامەكە بڕوانە وێنەی ٤



پاشان بۆ گۆڕینی جۆری ڤیدیۆكه كلیك له‌سه‌ر فه‌رمانی convert ده‌كه‌ین ئنجا ده‌بینین جۆری ڤیدیۆكه ده‌گۆڕێت بۆ جۆری DivX بڕوانه وێنه‌ی٥



ئنجا پاش ته‌واوبونی ریندەرەكە لیستێك دێت كه له‌سه‌ره‌وه ok نوسراوه هه‌روه‌ها له‌ژێره‌وه‌ش view Files ئه‌گه‌ر view Files كلیك بكه‌ین ئه‌و شوێنه ده‌بێته‌وه كه DivX تێیدا خه‌زن بووه بڕوانه وێنه‌ی٦



# بەرنامەی Flash2Video

کۆمپیوتەر



ئەم بەرنامەیە بەرنامەیەکی یەکجار پێویست و گرنگە بە تایبـەتی بـۆ ئەوانـەی دەیانـەوێ فـایلی جـۆری فـلاش بگۆرن بۆ ڤیدیۆ چوونکە ئەم کارە بە کارێکی یـەکجار گرنگ وەسف دەکرێ بۆیە بە پێویستی دەزانم کە باسی چۆنیەتی گۆرینی فـایلی جـۆری فـلاش بـۆ ڤیـدیۆ و هـەروەها گۆرینی ڤیدیۆش بۆ جۆری فلاش لـە بەشی داهاتوو وەك هەموومان دەزانین بەرنامەی فلاش زۆربەی پێکهاتـەکانی ئەنتـەرنێت پێـك دەهێنێـت بـەلام کـار پێکردنی ئـەم بەرنامەیـە زۆر ئاسـان نیـە بۆیـە دەبێـت پـشت بەوبەرنامانـە ببەسـتین کـە فلاشـەکانمان بـۆ دەکەنەوە ڤیدیۆ بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە شتێکی زۆر سـانایە سـەرەتا پـاش دابەزانـدنی بەرنامەکـە لەسـەر ئامێری کۆمپیوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان لەسەرەوەی بەرنامەکە لەلای چەپ Add Flash to list نوسراوە سەرەتا بۆهێنانی ئەوپارچە فلاشەی کە دەتەوێ بێتە ناوبەرنامەکە Add Flash to list کلیك دەکەیت لەوێوەش Add a flash file لێدەدەیت ئنجا لیستی هاردەکان دەبێتەوە بەم شێوەیە وێنە ١

ئەوپارچە ڤیدیۆیەی کە لەناو هاردەکەت داتناوە یەك کلیکی لەسەر دەکەیت ئنجا open لێدەدەیت راستەوخۆ لیستێکی تر دەبێتەوە دوو بۆشایی لەو لیستەدا هەیە بۆشایی دووەم کـە Outputformat ی لـە تەنیـشدا نوسـراوە پێـت دەڵێـت بـەچ جۆرێـك ڤیدیۆکـە خـەزن دەکـەیت واتـا svcd dvd vcd یـــەکێکیان بـــەدڵی خـــۆت هەڵدەبـژێریت ئنجـا پاشـان ok لێـدەدەیت هـەروەك لـە وێنە ٢ دا دەردەکەوێت



هه‌روه‌ها له‌سه‌ره‌وه‌ی به‌رنامه‌كه out put folder هه‌یه‌ ئه‌وه‌یان پێت ده‌ڵێت ڤیدیۆكه‌ له‌كوێ خه‌زن ده‌كه‌یت وێنه‌٣



ئنجا پاشان له‌ خواره‌وه‌ی به‌رنامه‌كه‌ له‌ لای چه‌پ convert now هه‌یه‌ یه‌ك كلیكی له‌سه‌ر ده‌كه‌یت بۆئه‌وه‌ی ریند‌ه‌ر بێت واتا فلاشه‌كه‌ بگۆرێت بۆ ڤیدیۆ وێنه‌٤



# بەرنامەی
# Video to Flash Converter

کۆمپیوتەر

بەرنامەی Video to Flash Converter پێچەوانەی بەرنامەکەی پێشووە کە باسی گۆڕینی فایلی فلاشمان کرد بۆ جۆری ڤیدیۆ بەڵام ئەم بەرنامەیە پێچەوانەی ئەو بەرنامەیەی پێشووە کە بەرنامەیەکی یەکجار پێویست و گرنگە بەتایبەتی بۆ ئەوانەی دەیانەوێ پارچە ڤیدیۆ یاخود گۆرانی بخەنە ناو سایتەکانیان لە ئەنتەرنێت بێ ئەوەی شوێنێکی زۆر داگیر بکات بەڵکو من دەڵێم هیچ شوێنێك داگیر ناکات چونکە من تاقیکردنەوەی خۆم ئەنجام داوە لەسەر ئەوبەرنامەیە بۆیە وا بە راشکاوانە باس لەم بەرنامە بەسودە دوای دابەزاندنی بەرنامەکە من بۆ تاقیکردنەوەی بەرنامەکە ویستم لە توانای بەرنامەکە بگەم کە بەرنامەکەم کردەوەبینیم داوای ڤیدیۆیەکم لێ دەکات منیش پارچە ڤیدیۆیەکم خستە ناو بەرنامەکە کە قەبارەی ئەو ڤیدیۆیەی کە من خستمە ناو بەرنامەکە بریتیبوو لە ٤٦ میگابایت پاشان کە بەرنامەکە کۆنڤێرت کرد سەیرم کرد قەبارەی ڤیدیۆکە بریتیبوو لە ٨٨٦ بیت واتا یەك کیلۆ بایتیش نەبوو هەروەها شێوەکەشی گۆڕا بۆ جۆری فلاش بە راستی کە ئەم شتەم بینی سەرسام بووم بە توانای ئەو بەرنامەیە وەك هەموومان دەزانین بەرنامەی فلاش زۆربەی پێکهاتەکانی ئەنتەرنێت پێك دەهێنێت بەڵام کار پێکردنی ئەم بەرنامەیە زۆر ئاسان نیە بۆیە دەبێت پشت بەو بەرنامانە ببەستین کە هەر ڤیدیۆێکمان بۆ دەکەنەوە فلاش بێگومان هەر شتێکیش ببێتە فلاش زۆر بەئاسانی دەچێتە ناو سایتەکان بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە شتێکی زۆر سانایە سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لە سەر ئامێری کۆمپیوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان بەرنامەکە دوو بۆشایی تێدایە لە تەنیشت بۆشایی یەکەم Video نوسراوە هەروەها لەتەنیش بۆشایی دوەم Flash نوسراوە وێنە ١



سەرەتا بۆ هێنانی ئەو پارچە ڤیدیۆیەی کە دەتەوێ بێتە ناو بەرنامەکە بۆشایی یەکەم کلیك دەکەیت واتا ئەوبۆشایەی کە Video ی لەتەنیشتدا نووسراوە یەکجار بەماوس کلیکی لە سەر دەکەیت لیستی هاردەکان دەبێتەوە بەم شێوەیە وێنەی ٢



پاشان ئەو پارچە ڤیدیۆیەی کە لە ناو هاردەکەت داتناوە یەك کلیکی لە سەر دەکەیت ئنجا open کلیك دەکەیت دەبینی پارچە ڤیدیۆکە راستەوخۆ هاتۆتە ناو بەرنامەکە و ناوی ئەو پارچە ڤیدیۆیە لەناو بۆشاییەکاندا نوسراوە وێنەی ٣



هەروەها بۆشایی دوەم کە Flash ی لەتەنیشدا نووسراوە ئەو بۆشاییە پێت دەڵێت ڤیدیۆکەت کە گۆرا بۆفلاش لەکوێ خەزنی دەکەیت دەتوانیت دەست کاری نەکەیت هەر لەو شوێنەی ڤیدیۆکەت هێناوە لەوێ خەزن دەبێت هەروەها لە ژێر ئەو دوو بۆشاییانە هێمایەك دیارە کە لە تەنیشتی Quality نووسراوە هەروەها ٣ ژمارە لەژێرەوەی هیماکەدا هەیە کەبریتین لە ٠ ٥٠ ١٠٠ هەرچەند ئەو هێمایانە بەرەو زیاتر ببەیت ئەوا رووونی ڤیدیۆکە جوانتر دەبێت هەروەها لەژێر ئەوانەش Start نووسراوە هەر کاتێ بمانەوێ ڤیدیۆکە بگۆرین بۆ فلاش ئەوا یەك کلیك لەسەر فەرمانی ستارتدەکەین بروانە وێنەی ٤



# به‌رنامه‌ی فلاش Mx

## زنجیره( ١٤)

ئا: گه‌ردی

**کاریگه‌ریه‌کانی نووسین له فلاشدا**

کاریگه‌ریه‌کانی نووسین له فلاشدا سنووردار نیه به کۆمه‌ڵێ فه‌رمانی دیاری کراو به‌ڵکو والآیه له به‌ردەم به‌کارهێنه‌ری فلاش بۆ بنیاتنانی ئه‌و کاریگه‌ریانه‌ی ده‌مانه‌وێ.

نمونه‌ی (١)

لەم نمونه‌یه‌دا نوسینێك ده‌نووسین با هه‌ردوو پیتی (EA)کاریگه‌ریشی له‌سه‌ر دانێین سه‌ره‌تا بچوك بێت دواتر گه‌وره بێت (Fade Out).

١. دوو چین درووست ده‌که‌ین چینی یه‌که‌م بۆ پیتی (E) وه‌چینی دووه‌م بۆ پیتی (A)

- له چینی یه‌که‌م ده‌چینه سه‌ر ئامرازی ده‌قه‌کان و پیتی E ده‌نوسین و قه‌باره‌ی نوسینه‌که‌ش با ١٢ بێت پاشان ده‌چینه سه‌ر چوارچێوه‌ی ژماره ١٠ و چوار چێوه‌ی کلیل ده‌ئاخنینه نێو چوار چێوه‌که ، و جوڵه‌ی Motion tweenی بۆدرووست ده‌که‌ین.
- له‌سه‌ر چوارچێوه‌ی ژماره ١٠ قه‌باره‌ی پیته‌که گه‌وره ده‌که‌ین و له رێگای فه‌رمانی Scale .

٢. چینی دووه‌م : پیتی A که له چوارچێوه‌ی ژماره ١٠ له‌سه‌ر چینی دووه‌م ده‌ست پێده‌کات ،قه‌باره‌که‌ی ١٢ له رێگای فه‌رمانی Scale و له‌سه‌ر چوارچێوه‌ی ژماره ٢٠ هه‌مان کردار دووباره ده‌که‌ینه‌وه له‌گـه‌ل پیتی یه‌که‌م . کاره‌که‌مان پێویسته وه‌ك وێنه‌ی (١) بێت .



٣. پێویستە لە چوارچێوەی ژمارە ١٠ تا ٣٠ سەبارەت بەپیتی E دیار و جێگیر بێت ، و سەبارەت بە پیتی دووەم Aلەچوارچێوەی ژمارە ٢٠ تا ٣٠ جێگیر بێت .

نمونە (٢) :

جولەی دەق لە چەماوە : دەقێك دەنووسین لە میانەی چەماوەیەكی دیاریكراو بجولێتەوە دەقەكە دەنووسین لەسەر چینی یەكەم باماوەی جولەكە ٦٠ چوارچێوە بێت .جولەیMotion tweenی بۆدرووست دەكەین ، كلیكی راستە لەسەر چینەكە دەكەین فەرمانی Add a Motion guideهەڵدەبژێرین چینێكی نوێ بەدەردەكەوێت چینەكە بەچینی رێبەری جولە دیاری دەكەین و وێنەی چەماوەیەك بە ئامرازی قەڵەم دەكێشین ، دەچینە سەر چینی یەكەم و لەسەر چوارچێوەی ژمارە (١) نوسینەكە دەخەینە سەر سەرەتای چەماوەكە و لەسەر چوارچێوەی ژمارە ٦٠یش نوسینەكە دەخەینە كۆتایی چەماوەكە (پێویستە چەماوەكە كراوە) .كارەكە بەم شێوەیە دەبێت كەلەوێنەی (٢) دیارە .




- لەكیبۆرد هەردوو دووگمەی Ctrl+Enter دادەگرین بۆ بینینی ئەنجامی كارەكەمان وێنەی (٣) .






# به‌رنامه‌ی avs video بۆ گۆڕینی فۆرماتی هه‌موو جۆره‌کانی ڤیدیۆ



ئه‌وانه‌ی ئاره‌زووی کاری مۆنتاج وکاری ڤیدیۆیی ده‌که‌ن زۆر هه‌وڵی ئه‌وه‌ده‌دن که جۆری به‌رنامه‌ی تاز به‌کاربێنن بۆ جوانکردنی کاره‌کانیان له‌لایه‌کی تره‌وه زۆر له‌وکارانه‌ی که ئه‌نجام ده‌دریٚ زۆر کات و گۆڕانکاری پێویست ده‌بێت زۆر جاری واهه‌یه دوو تا چوار به‌رنامه به‌کار ده‌هێندرێت بۆ ڕاپه‌راندنی کاره‌کانیان به‌ڵام به‌هۆی ئه‌م به‌رنامه‌وه ده‌توانرێت هه‌موو کاره‌کان به ئاسانی ڤیدۆیه‌کانت بگۆڕی بۆ جۆرێکی تر هیچ پێویستی به به‌رنامه‌ی تر ناکات به‌کار بهێندرێت بۆ گۆڕینی ڤیدیۆیه‌که‌ت ئه‌م به‌رنامه‌یه‌ش به‌م جۆره کارده‌کات، له‌به‌شی یه‌که‌م دا باسی گۆرانکاریه‌کان ده‌که‌ین جۆره ڤیدۆییه‌کان له‌ژماره‌ی داهاتووی گۆڤاره‌که‌دا به‌شی دووه‌م باس ده‌که‌ین.



له‌سه‌ره‌تادا به‌کلیك کردن له‌سه‌ر به‌نامه‌که بونه‌وه‌ی به‌رنامه‌که‌دا پاش که‌مێك چاوه‌ڕوانین بڕوانه وێنه‌ی ۲



له ڕووبه‌ری به‌رنامه‌که‌دا ده‌بینین که کۆمه‌ڵێك فه‌رمان و هاوکێشه هه‌یه که‌ئێمه ده‌بیٚ به‌پێی ئه‌و جۆره گۆڕانکارییه‌ی که‌ده‌مانه‌وێت بیگۆڕین له‌لای ڕاسته‌وه که نووسراویbrowse ی یه‌که‌م ده‌که‌ینه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و ڤیدیۆیه‌ی که ده‌مانه‌ویٚ بیگۆڕین به‌کلیك کردن له‌سه‌ر ئۆپن فایله ڤیدیۆیه‌که ده‌ست نیشان ده‌کرێت بڕوانه وێنه‌ی ۳



له‌پاشـان كليـك له‌سـه‌ر browse ی دووه‌م ده‌كـه‌ين بـۆ خه‌زن كردنی ئه‌وفايله‌ی ڤيدۆيه‌ی كه‌ ده‌مانه‌وێ بيگۆڕين كليك له‌سه‌ر save ده‌كه‌ين بۆ خه‌زن كردن له‌و شوێنه‌ی كه‌ده‌مانه‌وێ بڕوانه‌ وێنه‌ی٤



له‌پاش ئه‌م هه‌نگاوه‌ ده‌چينه‌ ئه‌و فه‌رمانه‌ هه‌ڵده‌بژێرين كه‌ ده‌مانه‌وێ بۆ نموونه‌ ده‌مانه‌وێ فه‌رمانی گۆڕينی فايلی vcd بۆ mp٤ ده‌ست نيشان ده‌كه‌ين كليكی له‌سه‌ر ده‌كه‌ين بڕوانه‌ وێنه‌ی ٥



له‌دوای هه‌ڵبژاردنی فه‌رمانه‌كه‌ ده‌چينه‌ له‌سه‌ر فه‌رمانی edit profile بـۆ كردنـه‌وه‌ی جـۆره‌ هاوكێـشه‌كانی ڤيديۆيی بڕوانه‌ وێنه‌ی ٦



له‌پاش بوونه‌وه‌ی ئه‌و هاوكێشانه‌ی له‌ناو edit دا هه‌یه ده‌بینین چه‌ندین جۆری هاوكێشه‌یی تێدایه‌و فه‌رمانیشی تێدایه بروانه وێنه‌ی ٧



له‌و ژماره‌ی خواره‌وه كه دانراوه ده‌توانرێت بیگۆڕین بۆ زیاد كردنی ژماره‌كان به‌پێی زیاد كردنی ژماره‌كان جۆری هاوكێشه‌كان ده‌گۆردرێت بۆ بچوك كردنه‌وی قه‌رباره‌كان dpi ی ڤیدیۆیه‌كه بڕوانه وێنه‌ی ٨



له‌پاش ته‌واو كردنی هه‌موو كاره‌كان ده‌بێ هه‌موو كاره‌كان و فه‌رمانه‌كانی خه‌زن بكه‌ین بۆ جێ به‌جێ كردنی ئه‌و كاره‌ی كه‌هه‌ڵمان بژاردووه بۆ كلیك له‌سه‌ر save ده‌كه‌ین بۆ خه‌زن كردنی بروانه وێنه‌ی ٩

به‌م جۆره ده‌بینین كه كاره‌كه‌مان ته‌واو بوو له‌به‌شی داهاتوودا باسی ئه‌وه ده‌كه‌ین كه‌به‌هۆی ئه‌و به‌رنامه‌یه‌وه فایلی ڤیدۆیی خه‌زن بكه‌ین (capture) ی ده‌كه‌ین

# دانانی نامەی دەنگی و نووسین لەسەر وێنەیەك

ئامادەکردنی: د.پشتیوان یحی
Kurd3@walla.com

بەرنامەی (Photoshop) کە بەرنامەیەکی زۆر بە کارهاتووی ناو کۆمەڵگەی ئێمەیە، وەك هەر بەرنامەیەکی تر فراوانی و پانتاییەکی زۆری هەیە بۆ سوود لێوەرگرتن، بێگومان هەموو کەسێك بەپێی زانیاری و لێزانینی خۆی سوودمەند دەبێت لە هەر بەرنامەیەك و کار کردنێکی لەسەر کۆمپیوتەر. بە هەر حاڵ ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە روونی بکەینەوە چۆنێتی دانانی نوسینێك یان دەنگێك لەسەر وێنەیەك و بێ ئەوەی لەوێنەکەدا دەربکەوێت تەنها بە شێوەی ئایکۆنێکی بچوك نەبێت. بەم شێوەیەی خوارەوە:

1. بۆ دانانی نووسین:

A. لەسەر شریتی ئامێرەکان (tools) کلیك لەسەر (note tool) بکە بڕوانە وێنەی ١.



وێنەی ژمارە ١

B. دوای ئەوە دەبینیت کەنیشاندەری ماوس شێوەکەی دەگۆڕێت و لەهەر شوێنێکی سەر وێنەکە کلیك بکەیت چوارچێوەیەك بۆ نوسین دەبێتەوە و ئەوەی مەبەستتە تێیدا دەنوسیت، پاشان دەتوانیت دایبخەیت بڕوانە وێنەی ٢.



وێنەی ژمارە ٢

سەیر دەكەیت چوارگۆشەیەكی بچـــوك دروست بووە كە بەئاســـانی دەتوانرێـــت بیگوازیتەوە، و بە كلیكـــی راست لەسەری و هەڵبژاردنی (open note) نوسینەكەمان دەردەكەوێتەوە بڕوانە وێنەی ٣.



وێنەی ژمارە ٣

2. بۆ دانانی دەنگ:

لەسەر شریتی ئامێرەكان (tools) كلیكی ڕاست لەسەر (note tool) بكە و (audio annotation tool) هەڵبژێرە، دەبینیت كە شێوەی نیشاندەری ماوس وەك ئایكۆنێكی دەنگی لێدێت بڕوانە وێنەی ٤.



وێنەی ژمارە ٤

B. لەهەر شوێنێكی وێنەكە كلیك بكەیت چوار چێوەیەكت بۆ دەكرێتەوە(سەیری وێنەكە بكە)، كە تیایدا:

- (Start) بۆ دەست پێكردنی تۆماركردنی دەنگ.
- (Stop) بۆ كۆتایی هێنانی تۆمار كردن.
- (Cancel) بۆ پاشگەزبوونەوەی تۆماركردن.

كلیك لەسەر (start) بكە دەبینیت دەست بە تۆماركردن دەكات، و بۆ كۆتایی هێنانی تۆماركردن (stop) كلیك بكە، دەبینیت كە ئایكۆنی دەنگ لەسەر وێنەكە درووست بووە. و بۆ بیستنەوەشی كلیكی راست بكە و (play) هەڵبژێرە بڕوانە وێنەی ٥.




وێنەی ژمارە ٥

چۆنێتی خەزن كردنی:

- كلیك لەسەر (file) بكە و فرمانی (save) هەڵبژێرە.
- لەو ویندۆسەی كە دەبێتەوە لە شوێنی (file name) هەرناوێك بنوسیت دەگونجێت بەڵام لە بەرامبەر (format) دەبێت (Photoshop PDF) هەڵبژێریت و پاشان كلیكی (save) بكە بڕوانە وێنەی ٦.



وێنەی ژمارە ٦

# چۆنیه‌تی دروست كردنی وێنه‌ی جوڵاو له‌به‌رنامه‌ی Image ready

ئا: پشتیوان
Kurd3@walla.com

به‌رنامه‌ی (Image ready ) كه‌ وه‌ك پاشكۆیه‌كی به‌رنامه‌ی (photo shop) كه‌ له‌گه‌ڵ دابه‌زاندنی (setup) به‌رنامه‌ی (photo shop) داده‌به‌زێنرێت یه‌كێكه‌ له‌و به‌رنامانه‌ی كه‌ كۆمه‌ڵێك كاری زۆر جوانی پێ جێ به‌جێ ده‌كرێت له‌ ده‌ستكاری كردن و رازاندنه‌وه‌ی وێنه‌ . ده‌توانین به‌چه‌ند رێگایه‌ك بچینه‌ ناو به‌رنامه‌كه‌وه‌.

وه‌كو:

كلیك له‌سه‌ر (start) بكه‌ دواتر له‌سه‌ر فه‌رمانی All programs ئنجا له‌ ناو ئه‌و لیسته‌دا بچۆره‌ سه‌ر فه‌رمانی adobe image ready.هه‌روه‌ها ده‌توانرێت هه‌ر له‌ به‌رنامه‌ی (photo shop) ه‌وه‌ به‌ كلیك كردن له‌سه‌ر فه‌رمانی (jump to image ready) وه‌ك له‌ وێنه‌ی ١ دادیاره‌ ، یان له‌ رێگای داگرتنی (ctrl+shift+M) له‌سه‌ر كیبۆرد.




وێـــــــنه‌ی 1

- فۆڵدەرێکی نوێ دەکەینەوە و ئەو وێنانە دەخەینە ناو بەرنامەکە کە دەمانەوێت بەدوای یەکدا دەرکەون. بەڵام دەبێت وێنەکان بە شێوەی زنجیرە ناویان لێ بنرێت و لە قەبارەدا یەکسان بن.
- بەرنامەکە دەکەینەوە.
- کلیك لەسەر (file)دەکەین و پاشان فەرمانی (import) ولەوێشەوە (folder as frames) هەڵدەبژێرین. وێنەی ٢




- ئەو فۆڵدەرە هەڵدەبژێرین کە وێنەکانمان لەناو داناون و (OK) دەکەین، دەبینین وێنەکانمان دێنە ناو بەرنامەکە و بە شێوەیەکی ئاسۆیی لە ژێر وێنەی یەکەمدا ریز دەبن .
- ماوەی پێشاندانی هەر یەك لە وێنەکان دیاری دەکەین کە لەژێر هەر وێنەیەك دادەنرێت. وێنەی ٣



• بۆ خەزن (Save) کردنی کارەکەمان کلیك لەسەر فایل (File) دەکەین و لەوێشەوە (Save optimized) کلیك دەکەین. وینەی ٤




• بە ئارەزووی خۆمان ناوێکی بۆ دادەنێین، بەلاّم هەر دەبێت جۆرەکەی (gif) بێت . پاشان فەرمانی (Save) کلیك بکە. وێنەی ٥






# بەرنامەی
# Accent Word Password Recovery

ئا: د.پشتیوان سەروچاوەیی
Kurd3@walla.com

زۆر جار مرۆڤ بە هۆی سەرقاڵیەوە ئەو ووشە نهێنیانە لە بیر دەکات کە دایناون بۆ هەر یەك لە زانیاریە تایبەتیەکانی خۆی بە تایبەتی دۆکومێنتە تایبەتیەکانی خۆی لە بەرنامەی ووٚرد (word)، بۆیە ئێمە لێرەدا چۆنێتی دۆزینەوەی ووشەی نهینی فایلەکانی بەرنامەی ووٚرد روون دەکەینەوە لە بەرنامەی **Accent Word Password Recovery** کە بەرنامەیەکی سادەیە و بە ئاسانی کاری پێ دەکرێت ... هەنگاوی یەکەم: دوای کردنەوەی بەرنامەکە کلیك لەسەر (open) دەکەین کە لە بەشی خوارەوەی بەرنامەکەیە و ئنجا ئەو فایلە دەکەینەوە کە دەمانەویت ووشە نهێنیەکەی (Password) بزانین.



هەنگاوی دووەم: لەسەر فەرمانی (run search)کە لە خوارەوەی بەرنامەکە هەیە کلیك بکە کە لە وێنەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە .



دوای ئه‌وه هه‌ڵبژاردنێک دێت که پێت ده‌ڵێت ئایا ده‌ته‌وێت له‌سه‌ر بنچینه‌ی فه‌رهه‌نگێك بیت که له ناو کۆمپیوته‌ره‌که‌ت دایه یان نا ؟. ئه‌مه‌ی یه‌که‌م هه‌ڵبژێره و کلیك له سه‌ر (next) بکه..




له پاشان (add dictionary) کلیك بکه و برۆ ئه‌و شوێنه‌ی که فه‌رهه‌نگه‌که‌ت تیا دابه‌زاندووه و فایلیك هه‌ڵبـژێره که بگونجێت له پاشان (open) کلیك بکه. (بێگومان ده‌بێت کۆمپیوته‌ره‌که‌ت فه‌رهه‌نگی تیا دابه‌زێنرابێت)



ئنجا (next) بكه‌. ده‌بینیت كه په‌نجه‌ره‌یه‌كی ترت بۆ ده‌كرێته‌وه و چه‌ند هه‌ڵبژاردنێكی تێدایه كه ئایا ده‌ته‌وێت له ناو فه‌رهه‌نگه‌كه‌دا چی و چۆن بگه‌رێت وه‌ك ژماره و ووشه‌ی گه‌وره و بۆشایی ....هتد. دوایی (next) و دواتریش (run search) كلیك بكه‌. ده‌بینین كه به‌رنامه‌كه ده‌ست به گه‌ران ده‌كات تا ووشه نهێنیه‌كه‌ت بۆ ده‌دۆزێته‌وه كه له‌به‌شی سه‌ره‌وه‌ی به‌رنامه‌كه‌دا ده‌نوسرێت وه‌ك له‌وێنه‌كه‌دا دیاره..




تێبینی :

- گه‌ران به‌دوای ووشه نهینیه‌كه‌دا له‌وانه‌یه ماوه‌یه‌كی زۆر بخایه‌نێت .
- ئه‌گه‌ر به‌رنامه‌كه (register) نه‌كرا بێت ووشه‌ی نهێنی زیاتر له چوار پیت یان هێما نادۆزێته‌وه.ده‌توانرێت (register) بكرێت له رێگای كلیك كردن له‌سه‌ر (to bypass this limitation) كه له‌سه‌ره‌تای كردنه‌وه‌ی به‌رنامه‌كه‌دا ده‌رده‌كه‌وێت.



# سوود وەرگرتن لە بەرنامەی Action بۆ کاروباری بێژەری یان وانە گووتنەوە

کۆمپیوتەر

ئەو کەسـانەی لـەبواری راگەیانـدن کاردەکـەن یـان ئـەو کەسانەی لەبواری مامۆستایی کاردەکەن دەتوانن بەهۆی کۆمپیوتەر وە بەرنامەی ئەکشن وانەکانیان بڵێنەوە یان ئەو کەسانەی لەبواری بێژەری کاردەکەن دەتوانن بەهۆی ئـەم بەرنامەیـە نوسـراوەکانیان ئاڕاسـتەی شاشـەی بەرامبەریان بکەن لەسەرەتا دەبێ کۆمپیوتەرەکە کارتی شاشەی ئاوتی تەلەفزیۆنی هەبێ (out TV) هەبێ کە بەهۆی ئەو کارتەوە شاشەی تەلەفزیۆنەکە دەبەسترێت بە کۆمپیوتەرەوە ئنجا لە شوێنی وەرگری وێنە (in TV) ئەگەر ئەکشنەکە وانە گووتنەوە بوو ئەوا رووی شاشەکە بەرەو قوتابییەکان دەبێ بۆ ئەوەی نوسراوەکان ببینن ، وەئەگەر بێژەر بوو ئەوا شاشەکە رووەو لە خۆی دەبێ لەجیاتی بەکارهێنانی نوسراو بەشێوەی وەرەقە بەشێوەی کۆمپیوتەر دەبێ و بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیەش بەم شێوەیە دەبێ لەسەرەتادا دەبێ ئێمە نوسراوەکان لەبەرنامەی وۆرد بنووسین و پاشان هەمووی نیشان بکەین ئنجا نووسینەکان کۆپی بکەین بڕوانە وێنەی ٢



پاشان دەچین بەرنامەی ئەکشن دەکەینەوە کلیك لەسەر (blank) قالبێکی بەتاڵ هەڵدەبژێرین کلیکی ئۆکەی دەکەین پەڕێکی سپیمان دەداتێ بڕوانە وێنەی ٣





پاش بوونه‌وه‌ی په‌ڕی سپی ده‌چینه سه‌ر edit و پاشان ده‌چینه‌سه‌ر paste كلیك ده‌كه‌ین بڕوانه وێنه‌ی ٤



پاشان ده‌بینین له‌سه‌ر په‌ڕه سپییه‌كه نوسراوه‌كه دێت به‌ڵام ده‌بینین نوسراوه‌كه نووسینه‌كه‌ی جۆره فۆنتێكه بڕوانه وێنه‌ی ٥



هه‌مووی ده‌ست نیشان ده‌كه‌ین واته select all كلیكی ڕاستی ماوس ده‌كه‌ین كلیك له‌سه‌ر font فۆنتی كوردی هه‌ڵده‌بژێرین بڕوانه وێنه‌ی ٦





دەبینین نوسینەکە دەگۆڕێت بۆ کوردی کە هەمان نووسینەکەیە کە ئێمە دەست نیشانمان کردوە بڕوانە وێنە٧



ئنجا لەبەرنامەکەدا لای راستەوە هێمای جۆلاوەکان دەبینین کلیك دەکەین چۆنیەتی هاتنی نووسراوەکان لەچەپەوە بۆڕاست لەڕاستەوە بۆ چەپ لەسەرەوە بۆ خوارەوە لەخوارەوە بۆ سەرەوە بڕوانە وێنەی ٨



لەدوا هەنگاو دا لەسەرەوە نیشانەی کارپێکردن واتە play ئینجا کلیك لەسەری دەکەین دەبینین نوسراوەکە بەو ئاراستە کاردەکات کەبۆمان دیاری کردووە پاشان لەلای چەپەوە هێمای تەلەفزیۆنەکە بەکاردێنین تاوەکو بە پڕی شاشە نووسراوەکان بەم جۆرە نووسراوەکان دەبینرێت لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکە. بڕوانە وێنەی ٩

# ناساندنی ناوی دوکۆمێنتەکان له سیستەمی دۆسدا

## زنجیرەی دووەم

ئا: باوکی ماریا




**ناوی دوکۆمێنت له دۆسدا دەکرێته دووبەش :-**

بەشی یەکەم / پێ ی دەوتریٚ بنچینه (Root)، وه پێویسته له ٨ پیت زیاتر نەبێت، وه ئەم بەشەی ناوی دوکۆمێنت پێویسته هەبێت، واته نابیٚ دەست بەرداری بین .

بەشی دووەم / ناوی لێنراوه پاشگر (extinction)، وه پێویسته له ٣ پیت زیاتر نەبێت، وه دەبیٚ هەردوو بەشەکه جیابکرێتەوه به نیشانەی خالٚ ، وه ئەم بەشەی ناوی دوکۆمێنت به ئارەزووی خۆته، واته دەتوانین بینووسین یاخود وازی لێبێنین، وه لەخوارەوه گرنگترین ئەو پاشگرانەی بەکاردەهێنرێت لەگەلٚ ناوی دوکۆمێنتەکه ڕوون دەکەینەوه :

| | | |
|---|---|---|
| BAT | BATCH | دوکۆمێنتی فەرمان کەیەکسەر جێبەجیٚ دەبێت . |
| Com | command | دوکۆمێنتی بەرنامه . |
| EXE | executable | دوکۆمێنتی ئاماده بۆ جیٚ بەجیٚ کردن . |
| Doc | Document | دوکۆمێنتی نووسین . |
| TXT | TEXT | دوکۆمێنتی نووسراو . |
| Asm | Assembly | دوکۆمێنتی دروستکراوی بەرنامه بەزمانی assembly . |
| BAK | Backup | دوکۆمێنتی یەدەگ . |
| BAS | BASIC | دوکۆمێنتی بەرنامه بەزمانی بەیسك . |
| DBF | DBASE FILE | دوکۆمێنتی بنکه زانیارییەکان . |
| PAS | Pascal | دوکۆمێنتی بەرنامه ، نوسراوه بەزمانی باسکال . |
| SYS | System | دوکۆمێنتی پێکهێنەری سیستەم . |
| C | C | دوکۆمێنتی دروستکراو بەزمانی سی (C). |

## چوونه نێو سیسته‌می دۆس

خێراترین رێگا بۆ گه‌یشتن به دۆس چوون بۆ لیستی start دوایی run وه نووسینی cmd یاخود command پاشان كلیكی ok كردن، ده‌بینین شاشه‌یه‌كی ره‌شت بۆ ده‌كرێته‌وه ، كه‌واته ئه‌مه‌یه جیهانی دۆس(**وێنه‌ی ژماره ١**) ، وه بۆ ده‌رچوون له سیسته‌می دۆس ووشه‌ی Exit بنووسه وه enter بكه ، یاخود شاشه‌كه دابخه .

## هێما به‌ربلاوه‌كان

له سیسته‌می دۆسدا دوو هێمای به‌ربلاو هه‌یه بۆ جێگا گرتنه‌وه‌ی ناو یان به‌شێك له‌ناو :-

1. هێمای (؟) / ئه‌م هێمایه كه‌له‌شێوه پرسیارزدا به‌كارده‌هێنرێت بۆ جێگای پیتێك له‌ناوی دوكۆمێنتێك، بۆ نمونه hawl?r.txt .
2. هێمای (*) / ئه‌م هێمایه به‌كارده‌هێنرێت بۆ ئه‌و كاته‌ی دوكۆمێنتێكت بوێت به‌هه‌ر ناوێك به‌لام پاشگره‌كه‌ی دیاری كراوبێت، بۆ نمونه txt.**** .

## جۆره‌كانی فه‌رمان له دۆسدا

فه‌رمانه ناوخۆییه‌كان : بریتین له‌و فه‌رمانانه‌ی كه‌یه‌كه‌ی یاد هه‌لگرتووه له‌كاتی ئیشكردنی كۆمپیوته‌ردا وئه‌م فه‌رمانانه له رێگای یه‌كه‌ی یادەوه جێ به‌جێ ده‌كرێن، نمونه بۆ ئه‌م به‌شه (Del-RD-MD-Date-Time-Cls) .

فه‌رمانه ده‌ره‌كیه‌كان : بریتین له‌و فه‌رمانانه‌ی له‌كاتی ئیشكردندا ناگه‌رێنه‌وه بۆ یه‌كه‌ی یاد، ئه‌م فه‌رمانانه له‌رێگای سیدی وفلۆپیه‌وه ده‌بێت و بۆ جێبه‌جێكردنی هه‌ر فه‌رمانێك پێویسته هه‌ركام له سیدی یان دیسكی نه‌رمت پێبێت ، نمونه بۆ ئه‌م به‌شه ( Disk comp – Disk copy – Format – Edit – SYS – comp) .

## فه‌رمانه‌كانی دۆس

فه‌رمانه‌كانی دۆس دابه‌ش ده‌بن بۆ سه‌ر شه‌ش گروپ :

**١. فه‌رمانی سیسته‌م :**

( command-Time-Defrag-Msd-Mode-Cls-Ver-Vsafe-Doskey-Mem-Date-Prompt-Me maker)

**٢. فه‌رمانی سیدی یان فلۆپی :**

( Disk comp-Sys-Disk copy-Chkdsk-Format-Un Format-Vol-Lable-FDisk-Ścandisk-Msbackup)

**٣. فه‌رمانی ناوه‌رۆك :**

(Move-CD-Append-Tree-MD-Date-RD-Dir-Del Tree) .

**٤. فه‌رمانی فایله‌كان :**

(Del-Copy con-Help-Sort-Print-REN-Copy-UN delete-Load fix-Type-More-Edit-X Copy-MSAV-Find) .

**٥. فه‌رمانه حه‌زمییه‌كان :**

(REM-Go To-Choice-Pause-For-Shift Call-IF-Echo) .

**٦. فه‌رمانه تایبه‌ته‌كان :**

(Fast Help-Drvspace.sys-CHCP-Graphics-Subst-Keyb-Install.high-Drvspace-Inter SVR-Replace-Power Fastopen-QBasic-Ctty-Debug-Nlsfunc-Loadfix-Inter Link-Verify-Load high-Expand-Recover ) .

## زانینی چه‌ند زانیارییه‌كی پێویست

1. به‌كارهێنانی (Control+C) بۆ كۆتایی هێنانی هه‌ر كردارێك .
2. به‌كارهێنانی دوگمه‌ی (/) كه‌به دابه‌ش ناو ده‌برێت، له‌گه‌ڵ هه‌موو هه‌ڵبژارده‌یه‌كی جیاوازدا به‌كاردێت ، بۆ نمونه (Dir/p) .
3. به‌كارهێنانی دوگمه‌ی پێچه‌وانه‌ی پێشوو (\) بۆ چوونه ناو چه‌ند به‌شێك بۆ نمونه له به‌شێكدا به‌شێكی ترهه‌یه ، ده‌ته‌وێت بچیته ئه‌و به‌شه‌وه به‌م دوگمه‌یه هه‌نگاوه‌كه كورت ده‌كه‌یته‌وه بۆ نمونه (CD C:\Windows\temp) .
4. بۆ چوونه ناو هه‌ركام له‌به‌شی دیسكی ره‌ق ئه‌م فه‌رمانانه ده‌نووسین :

بۆ چوونه نێو درایڤی سی (:c) / بۆ چوونه نێو درایڤی دی (:D)

بۆ چوونه نێو درایڤی ئی (:E) / بۆ چوونه نێو فلۆپی درایڤ (:A )

# گەڕاندنەوەی فایلە لە دەست چووەکان بە هۆی بەرنامەی Final Data

کۆمپیوتەر

زۆر جار بەهۆی هەڵەیەکی ویندۆزەوە یان بەهۆی فۆرمات کردنەوە یان تووش بوون بەڤایروس فایلەکانمان دەسڕێنەوە و لە ناو کۆمپیوتەرەکەدا نامێنن ئنجا بۆ چارسەر کردنی ئەم گرفتە دەتوانن بەرنامەی **Final Data** بەکار بێنن بۆ ئەوەی فایلە لە دەست چووەکانتان بگەڕێیننەوە ئەوەی لای خوارەوەش هەنگاوەکانی فێر بوونی ئەو بەرنامە بەهێزەیە.

پاش دامەزراندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەرەکەمان سەرەتا بەکردنەوەی بەرنامەکە دەچینە سەر فەرمانی Open و کلیك دەکەین وێنە٢

دواتر دەچین ئەو بەشە هاردەی کە فایلەکانمان لە ناودا پاراستبوو کە دواتر دوای فۆرمات سڕاونەتەوە نیشانی دەکەین و کلیك لەسەر OK دەکەین بڕوانە وێنەی ٣



وێنە ١


وێنە ٢

پاش کلیك کردن لەسەر OK دەبینین بەرنامەکە دەست دەکات بەگەڕان بۆ فایلە سڕاوەکان دوای چاوەڕوانی کردنێکی کەم ئەو فایلانەمان بۆ دەبینێتەوە کە لەگەڵ فۆرمات کردن سڕابوونەوە بڕوانە وێنەی ٤


وێنە ٣


وێنە ٤

ئنجا دوای ئه‌نجامدانی ئه‌و كرداره بچۆره سه‌ر ئه‌و به‌شه هارده ده‌بینن فایله سڕاوه‌كان وه‌كو خۆی ده‌بینرێت كه له‌سه‌ر به‌شه هارده‌كه بووه وه‌كو ناوی خۆی گه‌ڕاوه‌ته‌وه ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ خه‌زنی هه‌موو فایله سڕاوه‌كان بكه‌یین هه‌موو فایله‌كان دیاری ده‌كه‌ین ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ یه‌ك فایل خه‌زن بكه‌ین ئه‌وا ته‌نها ئه‌و فایله نیشان ده‌كه‌ین ده‌چینه سه‌ر فایل و ده‌چینه سه‌ر recover كلیك ده‌كه‌ین وه‌كوو وێنه٥



وێنه ٥

دواتر ئه‌وشوێنه‌ی ده‌مانه‌وێ فایله گه‌ڕاوه‌كه‌مانی تێدا خه‌زن بكه‌ین بڕوانه وێنه‌ی ٦



وێنه ٦

دواتر ده‌چینه سه‌ر save و فایله‌كه له‌و شوێنه‌دا ده‌پارێزین كه خۆمان ده‌ست نیشانی ده‌كه‌ین بڕوانه وێنه‌ی ٧



وێنه ٧

# وێنەکانت بکە بە سکرین سەیڤەر

ئا: پەژار صابر
pazhar@maktoob.com

هەر بەکارهێنەرێکی کۆمپیوتەر حەزدەکات ئەو وێنانەی هەیەتی لەناو کۆمپیوتەر بیکات بە سکرین سەیڤەرو یەك لەدوای یەك نیشان بدرێت وەکو ئەلبومی وێنە کاتێك دەست لە کۆمپیوتەر هەڵ دەگرێت یان کەمێك پشوو دەدەین لەکاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر.

١. سەرەتا کلیکی لای راست لەسەر دیسك تۆپ بکەو properties هەڵبژێرە و ئینجا کلیك لە سـەر screen saver بکە وەك وێنە(١)



٢. ئینجا لە ژێر screen saverدا my picture slide show هەڵبژێرە وەك وێنە(٢)



٣. پاشان کلیك لەسەر setting بکەو ئنجا کلیك لەسەر browse بکە بۆ هێنانی وێنەکانت کە لە چ بەشە هاردێکدا داتناوە وەك وێنە(٣)



٤. ئنجا ئەو فۆڵدەرە دەست نیشان بکە کە وێنەکانتی تێدایە و دواتر ok بکە وەك وێنە( ٤) دیسان ok بکەوە پاشان apply بکە ئێستا دەتوانی کلیك لەسەر preview بۆ بینینی ئەنجامەکەی.



# Reg Cleaner

## ده‌ست گرتن به‌سه‌ر تۆماركه‌ری سیسته‌م (Registry)

ئا / خۆشناو
kameran7605@yahoo.com

**Reg Cleaner** به‌رنامه‌یه‌كی زۆر سه‌ركه‌وتووه و زۆر پێویسته له ناو هه‌موو كۆمپیوته‌رێكدا هه‌بێت بۆیه هه‌وڵ بده‌ن ئه‌م به‌رنامه‌یه په‌یدا بكه‌ن و دایبمه‌زرێنن له‌سه‌ر ئامێره‌كه‌تان پاش ده‌ستكه‌وتنی به‌رنامه‌كه و دابه‌زاندنی له‌سه‌ر كۆمپیوته‌ره‌كه‌ت، هه‌ڵسه به كارپێكردنی به‌رنامه‌كه (وێنه‌ی ژماره١)



پێش ئه‌وه‌ی هیچ كردارێك ئه‌نجام بده‌ین هه‌ڵده‌ستین به‌م كاره، له لیستی option ده‌چین بۆ فه‌رمانی registry cleanup پاشان Backup و دوایی create only backup file، ده‌بینین نیشانه‌ی ڕاسته له ته‌نیشت ئه‌م هه‌ڵبژارده‌یه به دیار ده‌كه‌وێت (وێنه‌ی ژماره٢)



ئەم کرداره زامنی گەڕانەوەی زانیاریەکانت دەکات لە کاتی ڕوودانی هەڵەیەك، یاخود ڕەش کردنەوەی کردارێك بەهەڵە .

- دەتوانین بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە هەر بەرنامەیەکمان بوێت لای بەرین بە شێوەیەکی درووست، بەبێ ئەوەی هیچ پاشماوەیەك بەجێ بهێڵێت.
- دەتوانین بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە ئەم بەرنامانە لابەرین کە شاراوەن لە لیستی بەرنامەی add/remove program، بۆ لابردنی بەرنامەکان uninstall menu هەڵدەبژێرین ، پاش ئەمە بەرنامەکە دیاری دەکەین کە مەبەستمانە لای بەرین لەسەر ئامێرەکە، وە کلیکی دوگمەی uninstall دەکەین کە لەژێر پەنجەرەکەدایە (وێنەی ژماره ٣) .




بۆ بە دیارخستنی بەرنامە شاراوەکان ئەم کرداره دەگرینەبەر، لەلیستی option دەچین بۆ uninstall menu وەپاش ئەمە show all software دیاری دەکەین، پاشان ئەمە هەموو بەرنامە شاراوەکانمان بۆ بەدیار دەکەوێت کە لەسەر ئامێرەکەن .

بۆ خاوێن کردنەوەی registry لە فایلی ناپێویست یاخود پشت گوێ خراو، دەچین بۆ لیستی tools پاشان registry cleanup دوایی Do them all، ئەمیش بۆ لابردنی فایلەکانی OLE وە فایلە تاك لایەنەکان، پاش ئەم کرداره بەرنامەکە هەڵدەستێ بە گەڕان وەکوو لەوێنەکەدا دیاره (وێنەی ژماره٤)



پاش کرداری گەڕانەکە بەرنامەکە هەڵدەستێ بە پیشاندانی کۆمەڵەی ئەو فایلانەی کە بەرنامەکە دۆزیویەتەوە لە registry ، بۆ لابردنی هەموو فایلەکان کلیکی دوگمەی ctrl+a دەکەین لەسەر کیبۆرد بۆ دیاری کردنی گشت فایلەکان، و دوایی کلیکی دوگمەی remove selected دەکەین (وێنەی ژمارە٥)،




بۆ گەڕانەوە بۆ پەنجەرەی سەرەکی بەرنامەکە کلیکی دوگمەی Done دەکەین .

- کارێکی تری گرنگ لەم بەرنامەیە بریتیە لە لابردنی فایلاتی سیخوڕی .... ئەمە چۆن دەکرێت ؟ لە پەنجەرەی بەرنامەکە کلیکی دوگمەی startup List دەکەین، وە دەگەڕێین بەدوای بەرنامەی غەریب، و ئاگاداری ستوونی file name دەبین چونکە زانیاری تێدایە لەسەر بەرنامەکە (وێنەی ژمارە ٦) .



• کارێکی گرنگی تری لیستی Startup List بریتیە لەوەی کە دەتوانین ئەو بەرنامانە کەم بکەینەوە کە کاردەکەن لەکاتی سەرەتای چوونە نێو ویندۆز، کە بۆشاییەکی زۆر داگیر دەکەن لەسەر بیرەوەری RAM ، لەمەوە ئەو بەرنامەیە دیاری بکە کە دەتەوێ لای بەریت لە لیستی startup و کلیکی دوگمەی Remove selected دەکەین (وێنەی ژمارە ٧) .

RegCleaner 4.2 by Jouni Vuorio

File Select Options Search Tools Help

These programs are run everytime you start your computer. Try to keep this list as short as possible. selected 1 of 15

Software | Startup List | Uninstall Menu | File Types | New File | Shell Extensions | Backups

| Program | Filename | Loaded from |
| --- | --- | --- |
| ☐ | | HKEY_LM\Run |
| ☐ Adobe Gamma Loader | N/A | Start Menu (Common User) |
| ☐ Adobe Reader Speed Launch | N/A | Start Menu (Common User) |
| ☐ Ctfmon.exe | C:\WINDOWS\system32\ctfmon.exe | HKEY_CU\Run |
| ☐ Desktop | N/A | Start Menu |
| ☐ Desktop | N/A | Start Menu (Common User) |
| ☐ Igfxhkcmd | C:\WINDOWS\system32\hkcmd.exe | HKEY_LM\Run |
| ☐ Igfxpers | C:\WINDOWS\system32\igfxpers.exe | HKEY_LM\Run |
| ☐ Igfxtray | C:\WINDOWS\system32\igfxtray.exe | HKEY_LM\Run |
| ☐ Kav | "C:\Program Files\Kaspersky Lab\Kaspersky Anti-Viru... | HKEY_LM\Run |
| ☐ Microsoft Office | N/A | Start Menu (Common User) |
| ☐ Msmsgs | "C:\Program Files\Messenger\msmsgs.exe" /backgro... | HKEY_CU\Run |
| ☐ NeroFilterCheck | C:\WINDOWS\system32\NeroCheck.exe | HKEY_LM\Run |
| ☑ SigmatelSysTrayApp | Stsystra.exe | HKEY_LM\Run |
| ☐ TkBellExe | "C:\Program Files\Common Files\Real\Update_OB\re... | HKEY_LM\Run |

kameran7605@yahoo.com | New | Remove Selected | Exit

• لە گرنگی ئەو کردارەی کە لەسەرەتادا کردمان بریتیە لە گەڕانەوەی فایلە سڕاوەکان ئەمیش بەم شێوەیە ، کلیکی لیستی Backups دەکەین، پاش ئەمە فایلەکان دیاری دەکەین کە دەمانەوێت بیگەڕێنینەوە بۆ لیستەکە، و دوایی کلیکی دوگمەی Restore Backup دەکەین، و بۆ بەتاڵکردنەوەی لیستی Backups هەموو بەشەکان دیاری دەکەین و کلیکی دوگمەی Remove selected دەکەین (وێنەی ژمارە ٨) .

RegCleaner 4.2 by Jouni Vuorio

File Select Options Search Tools Help

Current Backups, selected 1 of 1

Software | Startup List | Uninstall Menu | File Types | New File | Shell Extensions | Backups

| Type of Backup | Description | Date | Time |
| --- | --- | --- | --- |
| ☑ Manual cleanup entries | | 10/28/2006 | 10:30:46 PM |

kameran7605@yahoo.com | Combine | Rename | Restore Backup | Remove Selected | Exit

# ڕۆڵی کۆمپیوتەر لە بواری ئەندازیاری

ڕیپۆرتاژ : ڕێناز ئەردەلان بەکر
فۆتۆ : سەروین عبدالله



لەگەڵ ئەوەی کۆمپیوتەر توانیویەتی هەموو بوارەکانی ژیان لەخۆ بگرێت بۆیە بواری ئەندازیاریشی گرتۆتەوە کە ئێستا تا ڕادەیەك کارەکانیان بەهۆی کۆمپیەتەرەوە جێ بە جێ دەکرێت . ئایا لە لایەن ئەندازیارانی ئێمەوە بە تەواوی سوود لەم ئامێرە وئەم زانستە وەرگیراوە ؟ ئایا قوتابیانی کۆلیژی ئەندازیاری لە وانەکانیان تا چەند پشت بەم ئامێرە دەبەستن و بەکاری دێنن ؟ هەر بەهەمان شێوەش سوودیان لە ئەنتەرنێت وەرگرتووە بۆ وڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە رووی پرسیارمان ئاراستەی قوتابیانی کۆلیژی ئەندازیاری کرد کە لە وەڵامدا گووتیان :



### سەرەتا : بۆتان مستەفا ئەحمەد قوتابی لە بەشی شارستانی دەڵێت :

ئەگەر بێت و باسی کۆمپیوتەر بکەین لە بواری ئەندازیاری بە تایبەتی هۆکاری سەرکەوتنی ئەندازە خۆی لە کۆمپیوتەر دەبینێتەوە لە رۆژگارێکی وەکو ئەمرۆدا قووتابیان تا رادەیەکی کەم کۆمپیوتەر بەکاردێنن هەرچەندە کەم کەس شارەزاییان هەیە بۆ نمونە لە کۆلیژەکەمان ئەوەی بەکاری دێنێت زیاتر خۆی فێری کۆمپیوتەر بووە نەك لە زانکۆ چوونکە لە کۆلیژ مەنهەجێکی ئاوا نیە کە فێرە کۆمپیوتەرت بکات لە بواری ئەندازە و ئەو بەرنامانەی کە ئێمە زیاتر کارمان پێیەتی هەردوو بەرنامەی (AutoCAD) و (3Dmax) کە نەمان توانیوە لە کۆلێژ بە تەواوی سوودی لێ ببینین هیوادارم لە زانکۆ بە تایبەتی لە کۆلیژی ئێمە ئەو بەرنامەی تایبەتن لە بواری ئەندازیاری سوودی تەواوی لێوەردەگیرین ببێتە مەنهەج و بخوێنرێ تاوەکوو قوتابیان هەموو سوودی لێ ببینن بۆ ئەوەی بتوانن لە دوا رۆژدا خزمەتی وولاتەکەیانی پێ بکەن .

### قوتابی هێژا عوسمان قوتابی به‌شی شارستانی گووتی :



ئێمه زۆر به كه‌می سوودمان له كۆمپیوته‌ر وه‌رگرتووه هۆكاره‌كه‌شی بۆ ئه‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه كه زۆربه‌ی قوتابیان شاره‌زاییان زۆر له كۆمپیوته‌ر نیه هه‌روه‌ها له سه‌ره‌تای قۆناغی خوێندنی كۆلێژه‌وه مه‌نهه‌جێكی تایبه‌تی فێربوونی كۆمپیوته‌رمان نیه كه به ته‌واوی فێری كۆمپیوته‌ر و ئه‌و به‌رنامانه‌مان بكات كه له بواری ئه‌ندازیاری به‌كاردێت راسته ئێستا له كۆلێژه‌كه‌مان له به‌شی پرۆگرام سازی تاقیگه‌یه‌كی كۆمپیوته‌ر كراوه‌ته‌وه كه كۆمپیوته‌ره‌كان هه‌مووی كۆمپیوته‌ری تازه‌ن به‌لاّم ئه‌مه‌ش ئه‌وه ناگه‌ینێت كه ئێمه‌ی قوتابیانی كۆلێژی ئه‌ندازیاری به‌ته‌واوی سوودمه‌ند بووین چونكه به‌ته‌واوی له سه‌ره‌تاوه شاره‌زاییمان نه‌بووه سه‌باره‌ت به ئه‌نته‌رنێتیش سه‌نته‌رێكی بچووكمان هه‌بوو ئه‌ویش ته‌نها بۆ چات به‌كار ده‌هات بۆیه هیوادارم تاقیگه‌ی گه‌وره‌ی كۆمپیوته‌ر و ئه‌نته‌رنێت له كۆلیژ بكرێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی هه‌موو قوتابیان بتوانن سوودی لێوه‌ربگرن و شاره‌زایش له‌م بواره په‌یدا بكه‌ن و هیوادارم قوتابیانیش هاوكار بن هه‌وڵی خۆ فێركردن بده‌ن .

### محمد اسماعیل قوتابی خوێندی بالاّ به‌م شێوه‌یه بۆمان هاته دووان :



زانستی كۆمپیوته‌ر زۆر سوودی هه‌یه بۆ بواری ئه‌ندازیاری كه هه‌ر به شه‌و تایبه‌تمه‌ندی خۆی هه‌یه و ده‌توانیٚ سوود له به‌رنامه‌یه‌ك وه‌ربگریٚ بۆ نمونه له به‌شی شارستانی ده‌توانین سوود له به‌رنامه‌ی ( Auto cad ) بۆ كێشانی وێنه‌كان به شێوه‌یه‌كی رێك و پێك و به ووردبینی هه‌روه‌ها به‌رنامه‌ی ( ستاد برۆ ) كه زۆر پێشكه‌تووه‌و كاری ژمێریاری و شیكردنه‌وه‌ی پێده‌كرێت كه پێشتر به‌ده‌ست ده‌مان كرد زۆر هیلاكی ده‌كردین كاتێكی زۆریشی ده‌ویست به‌لاّم ئێستا زۆر به ئاسانی بۆ ماوه‌یه‌كی كه‌م ده‌توانین به‌هۆی ئه‌و به‌رنامه‌یه‌وه ئه‌م كاره ئه‌نجام بده‌ین بۆیه ده‌توانم بلێم كۆمپیوته‌ر كار ئاسانیه‌كی زۆری له بواری ئه‌ندازیاری كردووه هیوادارم بتوانین له ئێستا و دوا رۆژدا به‌رنامه‌كانی بواری ئه‌ندازیاری به پێشكه‌تووی به‌كار بهێنین .

## قوتابی ئەحمەد فائز قوتابی بەشی شارستانی دەڵێت :



كۆمپیوتەر كە ئەمڕۆ بۆتە بەشێك لە پێویستی ژیان كە ئێمەی قوتابیانی كۆلیژی ئەندازیاری زۆر پێویستیمان بەو بەرنامانە هەیە كە تایبەتن بە بواری ئەندازیاری بۆ نمونە زۆربەی پرۆفیسۆرەكان لە ماڵپەرەكانی ئەنتەرنێت وانە دەڵێنەوە بە خێرایی جا ئێمە دەتوانین سوودی لێوەربگرین كە كارئاسانیەكی زۆرمان بۆ دەكات وە هەروەها دەتوانین بەهۆی كۆمپیوتەرەوە بۆ ماوەی چەند چركەیەك ئەو هێلكاری و وێنەكێشانەی دەمانەوێت بەشێوەیەكی زۆر جوان زۆر بە وردبینی بە دەستمان بكەوێت دەبێت ئێمەی قوتابی تەنیا پشت بەو مەنهەجە كەمەی كۆمپیوتەر كە هەمانە ببەستین بەڵكو دەبێ خۆشمان هەوڵی فێربوونی بەرنامەكان بدەین و بتوانین سوود لە ئەنتەرنێت وەربگرین بۆ نمونە من ٥٠ ٪ محازەرەكانم لە ئەنتەرنێت وەردەگرم ئەو كاتانەی كاتم هەبێت لەسەر ئەنتەرنێت بەسەری دەبەم چونكە زۆر لە زانكۆكانی ئەندازیاری جیهان وانەكانی خۆیان لەسەر ئەنتەرنێت دادەنێن منیش چ شتێكی بە سوودی تێدا هەبێت بۆخۆم سوودی لێ وەردەگرم .

## لەگوتایدا بەهزاد زەینەدین قوتابی بەشی شارستانی دەڵێت :



پەیوەندی كۆمپیوتەر لەگەڵ ئەندازیاری شارستانی زۆر بەرنامە هەیە كە یارمەتی دەرن بۆ ئەوەی كارەكان بە شێوەیەكی ڕێك وپێك بەرێوە بچێ و زۆر بەرنامەش هەن لەم بوارە بە تایبەتی هەردوو بەرنامەی (AutoCAD ) و ( ٣ Dmax) بەڵام ئەوەی گرنگە تا چەند ئەم بەرنامانە بەكاردەهێنین و سوودی لێ وەردەگرین كە ئەگەر بەراوردێك بكەین لە ساڵانی ڕابردوو بە ماندوو بوونێكی یەكجار زۆر كارەكان دەكرا بەڵام ئێستا دەبینین بەم پرۆگرامانە ماندووبوون كەم بۆتەوە بە وردبینیەكی ریك و پێك كارەكان دەكرێت كە من خۆم ڕۆژانە بەكاریان دێنم كە زۆر كار ئاسانیان بۆ كردووە سەبارەت بە ئەنتەرنێتیش بەردەوام سوودی لێوەر دەگرم و ڕۆژانە زانیاری لەسەر عەمەلی و نەزەری وەردەگرم كە ئەمەش پێویستیەكی بەردەوامە بۆ قوتابیانی زانكۆ ئەوەی كێشە بێ لێرەدا نەبوونی زانیاری زۆر دەربارەی ئەنتەرنێت كە هەندێك مامۆستا هەیە گرنگی بەم بوارە داوەو قوتابی فێر كردووە بۆیە بە بۆچوونی من لە سەرەتای خوێندنەوە واتا لە قۆناغی یەكەمی كۆلێژەوە لە بری هەندێك وانە كە زۆر پێویست نین كە بخوێندرێن مەنهەجێكی كۆمپیوتەری شامل هەبێت وە بخوێنرێ بۆ ئەوەی قوتابیان لە درێژی خوێندنیان پشتی پێببەستن و سوودی لێ وەربگرن .

# Teleport Pro v1.29
# داونلۆدکردنی سایتێکی ته‌واو بۆ سه‌ر ئامێره‌که‌ت

ئـا / کامه‌ران خۆشناو - شه‌قلاوه
kameran7605@yahoo.com

ده‌توانین به‌هۆی ئه‌م به‌رنامه‌یه‌وه به‌شێك یاخود سایتێکی ته‌واو به‌هه‌موو پێکهاته‌کانیه‌وه له تۆڕی ئینته‌رنێته‌وه دابه‌زێنینه سه‌ر ئامێره‌که‌مان، وه دوایی لاپه‌ڕه‌کانی هه‌ڵده‌ینه‌وه و سوودی لێوه‌ربگرین ، بێ په‌یوه‌ندی کردن به تۆڕی ئینته‌رنێت.

## کاری به‌رنامه‌ی Teleport pro v1.29

شیکردنه‌وه‌ی به‌رنامه‌که به‌پێی ئه‌و ژمارانه‌ی که‌له‌سه‌ر وێنه‌که‌دا دانراون .

١

کلیکی ئه‌م هه‌ڵبژارده‌یه ده‌که‌ین بۆ نووسینی ناونیشانی ئه‌و لاپه‌ڕه‌یه‌ی که‌ده‌مانه‌وێت دایبه‌زێنینه سه‌ر کۆمپیوته‌ره‌که‌مان، وه هه‌روه‌ها ده‌توانین لێره‌وه هه‌ڵبژاردنه‌کانی داونلۆده‌که دیاری بکه‌ین .

٢

بۆ بینینی ئه‌و سایته‌ی که دابه‌زێنراوه .

٣

بۆ ده‌ست پێکردنی کرداری دابه‌زاندنه‌که .

٤

بۆ وه‌ستاندنی کرداری دابه‌زاندن به شێوه‌یه‌کی کاتی .

٥

بۆ وه‌ستاندنی کرداری دابه‌زاندن به‌شێوه‌یه‌کی کۆتایی .

٦

وه‌ستاندنی دابه‌زاندنه‌که، له‌گه‌ڵ کۆتایی هێنان به‌کرداره‌که .

٧

بینینی ئه‌و فایلانه‌ی که دابه‌زێنراون له‌سه‌ر شێوه‌ی ئایکۆن .

٨

بینینی ئه‌و فایلانه‌ی که دابه‌زێنراون له‌سه‌ر شێوه‌ی لیست .

٩

بۆ بینینی فایله نوێیه‌کان له‌نێو سایته‌که .



# چه‌ند ماڵپه‌ڕێكی كوردی تایبه‌ت به‌فێربوونی به‌رنامه‌كانی كۆمپیوته‌رو ئینته‌رنێت

ئا: پژار
pazhar@maktoob.com

له‌ یه‌كێك له‌ ژماره‌كانی گۆڤاری كۆمپیوته‌ر به‌ڕێزێك چه‌ند ماڵپه‌ڕێكی كوردی هه‌مه‌ره‌نگی پێ ئاشناكردبووین بۆیه‌ منیش پێم باش بوو ئه‌م چه‌ند ماڵپه‌ره‌ كوردیه‌تان پێ ئاشنا بكه‌م كه‌تایبه‌تن به‌ فێربوونی به‌رنامه‌كانی كۆمپیوته‌رو ئینته‌رنێت.

www.compmagz.com
ماڵپه‌ری گۆڤاری كۆمپیوته‌ر
www.kurdishweb.net
یانه‌ی كوردیش وێب
www.c4kurd.com
ماڵپه‌ری كۆمپیوته‌ر بۆ كورد
www.g4kurd.com
ماڵپه‌ری گرافیك بۆ كورد
www.all4kurds.net
فێرگه‌ی هه‌موو بۆ كوردان

www.zkurd.org
ماڵپه‌ری زانست په‌روه‌رانی كورد
www.sherwan.net
ماڵپه‌ری شێروان نێت
www.it4kurd.com
ماڵپه‌ری ته‌كنه‌لۆژیای زانیاری بۆ كورد
www.kurditgroup.com
ماڵپه‌ری گروپی ته‌كنه‌لۆژیای زانیاری كوردی
www.best4kurd.com
ماڵپه‌ری باشترین بۆ كورد

## ئاگـــــــــاداری

بۆ هه‌موو ئه‌و به‌ڕێزانه‌ی كه‌ توانای نووسینیان هه‌یه‌ له‌ بواری كۆمپیوته‌ر وئه‌نته‌رنێت ئه‌گه‌ر توانای نووسینی بابه‌تیان هه‌یه‌ له‌م بوارانه‌دا ده‌توانن به‌شداری بكه‌ن له‌ گۆڤاری كۆمپیوته‌ر وده‌توانن سه‌ردانمان بكه‌ن یان بابه‌ته‌كانیان بنێرن بۆ ئه‌م ناونیشانه‌یه‌.

هه‌ولێر . كوردستانی عێراق / ناو بازاڕ به‌رامبه‌ر ده‌رگای قه‌ڵا باڵه‌خانه‌ی قه‌یسه‌ری حاجی یه‌حیا نهۆمی دووه‌م شوێنی نووسینگه‌ی گۆڤاری كۆمپیوته‌ر یان به‌ ژماره‌ ته‌له‌فۆنی ئاریا فۆن: ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی كۆڕه‌ك: ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان به‌ هۆی پۆستی ئه‌لكترۆنی:

E-mail: aras_co_center@yahoo.com
E-mail: computer_magazine_2005@yahoo.com

# بەهۆی سایتی (acm) دەتوانیت مۆبایلەكەت بەهەموو نەخشەكان و ناونیشانەكانی جیهان بەستیتەوە

كۆمپیوتەر

لەسەردەمی پێشكەوتنی تەكنەلۆژیای سەردەمدا دەبینی زۆر شتی تازە هاتۆتە دونیاوە یەك لەوپێشكەوتنانە ئامێری مۆبایلە كە زۆربەمان بەكاری دەهێنین بۆ ئاسانكاری بۆ كاری ڕۆژانەمان بەكارهێنانی مۆبایل لەهەموو جیهاندا ئەمڕۆ دەیبینین كە كاری پێدەكرێت بەهۆی ئەنتەرنێتەوە زۆربەی تۆڕەكان بەیەك دەبەستێتەوە.




بەهۆی ئەم سایتەوە دەتوانن لەگەڵ بەكارهێنانی ئەنتەرنێتەوە هەموو تۆڕەكانی مۆبایلەكەت ببەستستەوە وەهەروەها دەتوانرێت مۆبایلەكەت بكەیت بە ئامێری GPS وە كاری گەرانمان بۆ ئاسان بكات وە ناونیشانەكان بەشێوەیەكی سانا بۆ مان بدۆزێتەوە.




ئەم ماڵپەرە لە ٣ بەش پێك هاتووە.

١-یەكەمین بەش بۆ كاری ناونیشانەكان بەكاردێت و جۆرێك لە پێوانی پلەی گەرمی و ساردی و شەپۆلی هەواو كەشف كردنی باری هەورو بەفر بارین.

٢-بەشی دووەم تایبەتە بەو كەسانەی كەبەم سایتەوە پەیوەندیان هەیە بەتایبەتی بۆ بازرگانی وەهەروەها زانینی بۆرسەی جیهانی لەهەموو بارێكی بازرگانیدا دەزانرێت.

٣-بەشی سێیەمیشدا بەستنەوەی بە هەموو تۆرەكانی جیهاندا بروانە وێنەی ٢

سه‌باره‌ت به‌ چۆنیه‌تی بوون به‌ئه‌ندام له‌م سایته‌دا ده‌بێ به‌ پڕكردنه‌وه‌ی ئه‌و بۆشاییانه‌ی كه‌ داوامان لێده‌كات بۆ پڕكرنه‌وه‌ی بڕوانه‌وێنه‌ی ٣

له‌پاش پڕكرنه‌وه‌ی بۆشاییه‌كان نووسینی ژماره‌كه‌ لێ ده‌دین كه‌ ئه‌و فه‌رمانه‌ له‌كاتی پێویست خۆی داوا ده‌كات وله‌ ته‌نیشتیه‌وه‌ به‌ره‌نگاوره‌نگ نووسراوه‌ له‌پاشان كلیك له‌سه‌ر register ده‌كه‌ین دواتر ده‌بینه‌ به‌ئه‌ندام له‌م سایته‌ وه‌ئه‌گه‌ر هه‌ر هه‌ڵه‌یه‌ك هه‌بێ یاخود دووباره‌بوونه‌وه‌ی ناوێك هه‌بێ ئه‌وا ناتوانرێت ببیته‌ به‌ئه‌ندام . بڕوانه‌ وێنه‌ی ٤

تێبینی :

١. ده‌بێ هێڵی ته‌له‌فۆنه‌كه‌ت (سیم كارت) كۆدی جیهانی هه‌بێ .
٢. ده‌توانرێ له‌ناو مۆبایله‌كه‌ت ئه‌م كاره‌ بكه‌یت ئه‌گه‌ر مۆبایله‌كه‌ت ئه‌نته‌رنێتی تێدا هه‌بوو .
٣. دوو(٢) دۆلار له‌یه‌ك خوله‌ك سه‌رف ده‌كات كه‌هه‌ر زانیاریه‌كت بداتی .

# فێربوونی یاری شەترەنج لەکۆمپیوتەرەوە

ئا : هاوکار کۆیی

یاری شەترەنج یارییەکی دیارو ئەندازەی فکریە و مێژووییەکی گەورە و بەهێزی هەیە بۆیە ئارەزوومەندانی زۆرن ئەم یاریە لەگەڵ ئەوەی یاری کردنت فێر دەکات ناو جۆر و سیستەمی پارچەکانمان فێر دەکات بۆیە ئەو کەسەی کە یاری دەکات فێری ناوو جۆری نەخشەکان دەبێ ئنجا دەتوانێت وەك یاریزانێکی لێهاتوو یاری بکات بەشێوەیەکی ئەندازەیی فکری دەتوانێت لەم یاریەدا بەشێوەی گروپ یاری بکات و بەشێوەی تاکە کەس یان لەگەڵ کۆمپیوتـەروە دەتوانرێـت خـەزن بکرێـت ماوەیـەك بـۆ ماوەیەکی تر و ئەم یارییە بەم شێوەیە کاردەکات


وێنە ١

لەسـەرەتادا بەکردنـەوەی ئـایکۆنی یاریەکـە وێنەیـەکمان بـۆ دەردەکەوێ کە ناوی بەشداربوو داوا دەکات کە ناوێك تۆمار بکەیت و جۆری یارییەکە هەڵبـژێریت کە یەك کەس بێت یان زیـاتر لـە یـەك کـەس ئەگـەر گـروپ بـن ئـەوا خانـەی گـروپ هەڵدەبژێرین دوای کلیك کردن لەسـەر فـەرمانی OK دەکەیـن بڕوانە وێنەی ٢


وێنە ٢

پاش کردنەوەی یاریەکە دەچینە سەر فایل و یارییەکی نویێ دەکەینەوە بۆ ئەوەی لەسەرەتاوە دەست پێ بکەین رووبەرێکی تازەمان بۆ دروست دەبێ بۆ یاریکردن بڕوانە وێنەی ٣


وێنە ٣

پاشان دەست بەیاری کردن دەکەین و هەنگاوێك دەنێین تا کەسی بەرامبەر کە کۆمپیوتەرەکەیە هەنگاوێکی لەبەرامبەر هەنگاوەکەی تۆدا بنێت دەبێ سەربازەکان بۆ پێشەوە بڕۆن ئەگەر هەر هەڵەیەك رووبدات ئەوا یاریەکە قبوڵی ناکات هەنگاوەکە ناڕوات بۆ پێشەوە بڕوانە وێنەی ٤


وێنە ٤

ئەگەر تەماشای لای ڕاستی رووبەری یاریەکە بکەین لەهەر جوڵانێکدا دەبینین نوسراوێك زیاد دەبێت ناوی ئەو پیگەیە کە یاری پێدەکرێت بڕوانەوێنەی ٥


وێنە ٥

لەلای ڕاستەوە کلیك لەسەر هێمای score sheer پەرێك بە ژمارە دەبینین لە هەنگاوی سەرەتاوە ژمارە ١ بە جوڵەی یەکەم هاتووە بۆ نموونەش سەیری کلیلەکانی (f٢ f٣) بکە وەکوو وێنەی٦


وێنە ٦




ئەگەر بمانەوێت یاریەکە تەواو نەکەین و بەو شێوەیە هەڵیبگرین بۆ ئەوەی دواتر تەواوی بکەین دەتوانن خەزنی بکەنبۆ ئەنجامدانی ئەو کارەش بچۆرە سەر لیستی File و لەوێشەوە کلیك لەسەر فەرمانی save game as دەکەین بڕوانە وێنەی ٧

وێنە ٧




ئنجا دوا هەنگاو دەنێن واتا ئەو شوێنە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ دواتر یاریەکەی لێ بکەینەوە تا یاریەکە تەواو بکەین بڕوانە وێنەی ٨

وێنە ٨

## ئاگــــــــاداری

داوا لە هەموو خوێنەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین ئەگەر هەر بەڕێزێك پێشنیاری یان سەرنجێکی هەیە یان هەر کەم وکوڕیەکیان بەدی کرد لە گۆڤارەکە با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانەی خوارەوە

هەولێر . کورستانی عێراق / ناو بازاڕ بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی نووسینگەی گۆڤاری کۆمپیوتەر یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن: ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کۆڕەك: ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی:

E-mail: aras_co_center@yahoo.com
E-mail: computer_magazine_2005@yahoo.com

# بەرنـــــامەی Fl Studio
# بۆ کـــاری مۆسیقـــا

ئا : هاوکار عبد الرحمان

ئارەزوومەنـدانی مۆسـیقا دەبنـین ئەمڕۆکـە هـەموو کارێکـی هونـەری لـە ڕێگـای کۆمپیوتـەرەوە ئـەنجام دەدرێـت و هەروەهـا ئاسانکاری زۆرمـان بـۆ ئـەنجام دەدەن و بەشـێوەیەکی دیجیتـاڵ کاری دەنگی ئەنجام دەدرێت ئەم بەرنامەیە دەرچووی کۆنی هەیە بەڵام ئەم بابەتـەیان دەرچووی نویٚ یە زۆر گۆرانکاری پێوەیە وەك درامسی شەرقی و تراکاتی شەرقی بەسەمپڵ کردن بۆ کاری مۆسـیقای کـوردی ئێمـە لـەم بەرنامەیـە بەشـی یەکـەم باسـی پێهاتەکانی ئەم بەرنامەیە دەکەین .


وێنە ١

بەشی یەکەم :

لەگەڵ کردنەوەی بەرنامەکە دەچینە لای دەستی ڕاستی سەرەوە و هەڵبژادنی هێماکان ئنجا هێمـای یەکـەم دەکەینـەوە دەبینین چوار ڕیکۆرد وە سەمپڵ دەبینین بۆ نیشان کردنی بەخانەکانی دەنگی سەمپڵ دەردەچێت بڕوانە وێنە٢


وێنە ٢

ئنجا کلیك لەسەر هێمـای دووەم دەکـەین دەبینین خانـەی بـەتراك کردن خاڵدانان لە بەشەکانی تراکات بەشێوە ی ئەندازەیی بـەش بەش دەبێت بڕوانە وێنەی ٣


وێنە ٣

به‌کلیك کردنی له‌سه‌ر هێمای کیبۆرد (پیانۆ) ده‌بینین کیبۆردی پیکسله‌کان ده‌رده‌چێت ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ به‌کیبۆرد مۆسیقایه‌که ده‌ژه‌نین بڕوانه‌وێنه‌ی ٤



وێنه ٤

به کردنه‌وه‌ی تراکاتی ده‌نگی بۆ هاوکێشه‌کردنیان ده‌بینین ده‌توانرێت زیاتر له ١٠٠ تراکی ده‌نگی هاوکێشه بکات و ڕێکی بکات به‌یه‌ك ئه‌ندازه‌ی ده‌نگی کارده‌کات بڕوانه‌وێنه‌ی ٥



وێنه ٥

تێبینی له ژماره‌کانی تری ئه‌م گۆڤاره باسی چۆنیه‌تی بکارهێنانی ئه‌م به‌رنامه‌یه به ته‌واوی ده‌که‌ین بۆیه چاوه‌ڕوانی ژماره‌ی داهاتوو بن .

# مۆبایـــــــل

ئا: کامەران مەرزانی
Kamaran455.711@yahoo.com

مۆبایل یەکێکە لە داهێنانە پێش کەوتووەکانی جیهان و تەکنەلوژیای سەردەم. بەکەمترین قەبارە زۆرترین زانیاریت پێ دەبەخشی. و بە کەمترین ماوە بوو بە پێویستەکی مرۆڤ و رۆژانە لە هەموو جیهان ئەو ئامێرە بەکاردێنن. بەشێکی گرنگی کار و بەرنامەکان بە مۆبایل رێك دەخەن. تا ئێستا زۆر خەڵك هەڵگری مۆبایلن. کوردیش لەم پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای سەردەم بێ بەش نیە . رۆژ بەدوای رۆژ لە پێش کەوتندایە و ماوە ماوە مۆبایلی نوێ دەردەچێ. بێگومان هەر شتێك کە دەردەچێ بەبێ گرفت نابێ یان تێك دەچێ ئنجا گرفت زۆرە وەکو(وەستانی مۆبایل لەناکاو،شەودەیکوژێنیتەوە بەیانی هەڵنابێ،دوگمەیەکی کار ناکات،دوگمەی هێنانی بەرنامەکان نابێتەوە یان گەڕاندنەوەی مۆبایل بۆ سیستەمی خۆی وەکوو ئەوەی تازە کریت بێتت) ئنجا جارەسەری ئەم کێشانە بە فۆرمات کردنی مۆبایلەکە دەبێت ئەویش بەم رێگایانە دەبێت :

رێگای یەکەم

١. کاتێك مۆبایلەکەت کوژاوەتەوە پەنجە بنێ بەمانە
٢. دووگمەی پەیوەندی +هاژە+ژمارە سێ
٣. دەستت لەسەر ئەم دوگمانە بێ وە مۆبایلەکەت پێ بکە

رێگای دووەم

مۆبایلەکەت داگیرساندەوە ئەم کارانە بکە

١. هاژە * + پەنجەرە # +٧٣٧. + پەنجەرە
٢. ئنجا داوای هێمات لێ دەکات
٣. تۆش ئەمە بنوسە (١٢٣٤٥ ok

فۆرماتی رێگای دووەم بۆ ئەو مۆبایلانەی کە میمۆری دەچێتە سەر .

رێگای سێەم

١. هاژە * + پەنجەرە # + ٧٧٨. + پەنجەرە
٢. ئنجا داوای هێمات لێ دەکات
٣. ٣تۆش ئەمە بنوسە (١٢٣٤٥ ok
٤. ئەم فۆرماتە بۆ ئەو مۆبایلانەی کە میمۆری ناچێتە سەر
٥. رێگای چوارەم :بۆ فۆرمات کردن




دەبێ سیم کارت و میمۆری بهێنە دەر وە ئەم کارانە بکە، پەنجە لەسەر ئەم سێ دووگمەیە بێ *+ ok+ ژمارە سێ + هاژە و دەستت هەڵمەگرە مۆبایلەکەت پێ بکە .چاوەڕێ دەکەی تاوەکو فۆرماتەکە تەواو دەبێ.

# سیٚ بەرنامە بۆكار پیٚكردنی یاری

## Sega (Play 1) (play2)

ئا: كاوە سلیٚمان

سیٚ بەرنامەی گرنگ بەتایبەتی لەژیانی ئەمرۆماندا وابزانم هیچ ماڵیٚك نیە كۆمپیوتەریٚكی تیٚدا نەبیٚت بۆیە دەبیٚ هەوڵدەین هەمووكارەكانماندا پشت بەئامیٚری كۆمپیوتەر ببەستین لەبەرئەوەی كرینی سیٚ ئامیٚر شتیٚكی دروست نیە جا چ لەبارەی گرانی نرخەوە بیٚت یاخود گۆرینی سیٚ ئامیٚر هەموو رۆژیٚك بۆیە من بەباشی دەزانم هەمووتان ئەم سیٚ بەرنامەیە پەیدابكەن زۆر باشترە سەرەتا بەرنامەی یەكەم كەبریتیە لە Play ١ ئەم بەرنامەیە دەتوانیٚت هەموو سیدیەكی پلەی ١ لەسەر كۆمپیوتە ر كار پیٚ بكات بۆ هەموو كۆمپیوتەرو هەروەها بۆهەموو ویندۆزیٚكیش دەبیٚت كارپیٚكردن و دابەزاندنیشی زۆرئاسانە سەرەتا بەرنامەكە لەسەر ئامیٚری كۆمپیوتەر دادەبەزیٚنین پاشان دیٚین بەرنامەكە لەسەر رووبەری شاشە دەكەینەوە ویٚنە ١



ویٚنەی ١

ئینجا سیدیەكی یاری پلەی ستەیشن یەك دەخەینە سەر سیدی روومی كۆمپیوتەرەكە پاشان هەر لەو بەرنامەیە File دەكەینەوە ئینجا Run CD Rom كلیك دەكەین ویٚنە٢ پاشان راستەوخۆ دەچینە ناو یارییەكە ویٚنە٣



ویٚنەی ٢



ویٚنەی ٣

برگەی دوەم ئەویش بریتیە لەبەرنامەی play ٢ ئەو بەرنامەیەش یەکجار گرنگە کە ئێستا یاریەکەی زۆر باوە لەبازاڕەکاندا وە هەروەها جۆرەها یاری سەر سوڕهێنەری لێهاتۆتە کایەوە سەرەتا دێین بەرنامەکە دادەبەزێنین لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر پاشان دێین بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەر رووبەری شاشە وێنە ٤ پاشان سیدیەکی یاری پلەی ستەیشن دوو دەخەینە سەر دیڤیدی روومەکە بۆیە دەڵێم دیڤیدی رووم لە بەرئەوەی یاری پلەی ستەیشن خۆی دیڤیدیە بۆیە دەبێت ئێمەش سیدی روومەکانمان دیڤیدی بێت بۆکار پێکردنی پلەی دوو ئاگادارین تەنها پلەی دوو پێویستی بە دیڤیدی روومە واتا بۆئەوانی تر گرنگ نیە سیدی رووم بێت یاخود دیڤیدی رووم بێت پاشان هەر لەو بەرنامەیە File دەکەینەوە ئینجا Run CD لیَ دەدەین وێنە ٥




وێنە ٤




وێنە ٥

راستەو خۆ دەچنە ناو یارییەکە و دەتوانن بە کلیلەکانی سەر کیبۆردەکە ئەو یاریە بکەن بە ئارەزووی خۆتان و بە پێی جۆری یاریەکە بروانە وێنەی٦




وێنە ٦

برگەی سێیەم ئەویش بریتیە لە بەرنامەی سێگا SEGA ئەم بەرنامەیە زۆر پێویستە بە تایبەتی بۆ ئەوانەی سیدی یاری زۆر بەکار ناهێنن واتا زیاتر پشت بەیاری فایل دەبەستن واتا یاریەکان بەخەزن بە کاردێنن ئەم بەرنامەیە زۆر سادەیە یاریەکانیشی زۆر سادەو یاری زۆر خۆشی هەیە بەتایبەت بۆمندالآنی تەمەن بچووك زۆر پێویستە لەبەر سادەیی یاریەکەو هەروەها بەسودی یاریەکانی بۆ مندالآنی پچوك ئەم بەرنامەیە وەکوو بەرنامەکانی پێشوو نیە بەڵکوو ئەم یاریانە لەگەڵ دابەزاندنی بەرنامەکە دێنە ناو کۆمپیوتەر پاشان دەچیە ناو ئەوبەشە هاردەی کە ئەم بەرنامەیەت لە ناویدا هەڵگرتوە ئنجا لەوێوە ئەم بەرنامەیە دەکەیتەوە پاشان بەلای راست بەماوس یەك کلیك لەسەر بەرنامەکە دەکەیت لیستێکی نووسین دەبێتەوە لەسەرەوەی لیستەکە یەکەم نووسین بریتیە لە file لەوێوەش open cd room کلیك دەکەیت وێنە٧




وێنە ٧

پاشان لیستێك دەبێتەوە لەناو لیستەکەش فایلێك هەیە بەناوی Sega games دوو کلیك لەسەر ئەم فایلە دەکەیت دەچیتە ناو ئەم فایلە ئینجا ناوی هەموو یاریەکان لەناو ئەو فایلە نووسراوە هەرکامیانت بویَ یەك کلیکی لەسەر دەکەیت و پاشان open لێدەدەیت وێنە٨ ئینجا راستەو خۆ دەچیتە ناو یاریەکە وێنە ٩







وێنە ٨

وێنە ٩